


**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **واقیعی کوردستان و کردەوەی چاکسازی**
- نووسینی: سەرۆ قادر
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ١٦١٥
- نرخ: ١٥٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٨٨)





ماڵپەر: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com




## ناوەڕۆك







## پێشەكی:

وەك دەروازەیەك بۆ كتێبی چاكسازی و زیاتر روونكردنەوەی مەبەستم لەم نووسینە، بەپێویستی دەزانم لەسەر مانای چاكسازی واتە ریفۆرم بوەستم. پرۆسە و كردەوەی چاكسازی یەكێكە لە دیاردە زەقەكانی سەردەمی مۆدێرن و كۆمەڵگای پیشەسازیی. هەربۆیە لە قۆناغی سەرمایەداریدا بەتایبەتی بۆ جێگیربوونی ئەو سیستەمە، بە پێویست دەزاندرێ و وەك ئامرازێكی رێگاخۆشكار دادەندرێ. خۆ ئەگەر لە رووە مادديیەكەی چاكسازی وردبینەوە، ئەوە بە جۆرێكی رەخنەگرتن لەسەر كۆمەڵگا یان سیستەمێك لە سیستەمە پێكهێنەرەكانی دادەندرێ. لێرەدا دەردەكەوێ كە شێوازی رەخنەیی تەنیا زمانەوانی و ئەدەبناسین ناگرێتەوە بەڵكو دەكرێ لەسەر بوارە جیاجیاكانی كۆمەڵگا بەكاربێت.

رەخنە، بریتییە لە پێداچوونەوەی سیستەمێكی دیاریكراو یان دەقێكی دیاریكراو، دیراسەكردنی ئەرك و ئامانجەكانی هەر سیستەمێك و نیشاندانی ئەو ئاستەنگانەی لەبەردەم سیستەمەكەدایە. هەروەها دەستنیشانكردنی ئەو بەشە لە پێكهاتەكەی كە پێویستە بگۆڕدرێت تا بتوانێ لە ژیان بەردەوام بێت. هەڵبەت جاری وا هەیە سەرتاپای سیستەم لەكاردەكەوێ، لێرەدا رەخنە دەیسەلمێنێ كە سیستەم توانای بەردەوامبوونی نەماوە و لە هەردوو حاڵەتدا ئەلتەرناتیڤ یان جێگرەوەی بۆ پێشنیار دەكات. بۆیە رەخنە مانای تێكدان و رووخاندن نییە چونكە ئەگەر سیستەمێك لێكهەڵوەشێندرا پاشان ئەلتەرناتیڤی بۆ دانادرێ. بۆیە یەكێك لە كارە گرنگەكانی رەخنە دەربڕینی كەموكورییەكانە جا لە هەر بوارێكدا هەبێ. لێرەوە دەگوترێ رەخنە بنیادنەرە، بەو مانایەش بە داینەمۆی چاكسازی دادەندرێ. كەواتە چاكسازی كارێكی رەخنەگرانەی پشتبەستە بە زانستی و واقعی. روانگای جیاجیا لەسەر مانا و ئەركی رەخنە هەیە و بەتایبەتی لە زمانناسی و ئەدەبناسیدا زۆر بایەخی پێدەدرێ. هەڵبەت رەگێكی هاوبەش لە بەڵگەی هەموو بوارەكاندا هەیە



ئەویش رەخنە لە زانین(مەعریفە)ی مرۆڤدا بریتییە لەو بوارە پڕ لە زانیارییەی كەوا لە مانا و ئەرك و ئامانجی سیستەم دەكۆڵێتەوە، دوایی هەوڵدەدات لە واقیعدا پەیڕەوی بكات. واتە كەموكورییەكان دەستنیشان دەكات و رێگای لێ دەرباز بوونی نیشان دەدات. ئەوەیە چاكسازی دەخاتە ریزی چەشنێك لە چەشنەكانی رەخنە.

بەكارهێنانی رەخنە لەسەر سیستەمە جیاجیاكانی كۆمەڵگا كارێكی تازە نییە و رابردوویەكی دوورودرێژی هەیە. هەر لە شارە دەوڵەتەكانی یۆنان و ئیمپراتۆریی رۆم تا فەرمانڕەوایی دینی مەسیحییەت لە سەدەكانی ناوەڕاست، رەخنە هەبووە بەڵام لە رێنەسانسدا گەیشتە چڵەپۆپە و هاتە ناو ژیانی كۆمەڵگا. ئەوەش لەسەر دەستی ژمارەیەك رۆشنگەر دەستیپێكرد و كۆمەڵگای فیۆدالی و دینییان خستە ناو كاری رۆشنگەریی و پێداچوونەوە و ئەلتەرناتیڤ دانان. هەر بۆیە سەردەمی رێنەسانس بە سەردەمی چاكسازی دەژمێردرێ.

رەخنەی چاكسازانە شارێییەكی تەختی بەنسیب نەبووە، روانگای جیاجیای لەسەر هەبووە. بۆ نموونە ئەنارشیستەكان (ئاژاوەگێڕەكان) وایاندەزانی رەخنە دەبێ تەنیا روخاندن بێ، دوای ئەوە كۆمەڵگا خەیاڵییەكەی ئەوان بنیادبندرێ. لەوەڕا بۆ ماوەی دوو سەد ساڵ زیان و ئازارێكی زۆریان بۆ پرۆسەی چاكسازی لە ئەورووپا دروستكرد. پێشكەوتنی مەعریفە و زانست فكر و كردەوەی چاكسازی تۆكمەتر كرد و میتۆدی تایبەتی بۆ دانا تا وەك زانستێك پشت بە زانیاریی كردەوەیی ژیان ببەستێ و كار لەسەر دیكۆمێنتەكانی بكات ئینجا بیر لە گۆڕینیان بكاتەوە.

چاكسازی تەنیا لە یەك بواردا نییە بۆیە حەزدەكەم ئاماژە بە جۆرەكانی بكەم. وەك دەزانین كۆمەڵگا لە سیستەم (نسق، نظم)ی جیا جیا پێكدێ. دەكرێ رەخنە و پێشنیار بۆ هەریەكێكیان بكرێ، ئینجا داهاتووی چاككردنیشی لەبەرچاو بگیرێ. روانگای چاكسازی لە هەموو سیستەمەكانی پێكهێنەری كۆمەڵگا دەكۆڵێتەوە و نیشاندەدات كامیان لەكام بواردا بووەتە ئاستەنگ لەبەردەم پێكهاتەكانی كۆمەڵگا بە كۆ یان بە تاك بێت، ئینجا پێشنیار دەكات كە چۆن دەكرێ وەلابندرێن تا

کۆمەڵگا لە تەنگژە دەربچێ و کاروانی ئاسایی خۆی بگرێتەبەر. لەو حاڵەتەدایە کە ئازادی بواری بۆ دەڕەخسێ و زەمینەی سیستەمی دیموکراسی دەخەملێ. چاکسازی لە دیموکراسیدا هەمیشە زیندووە و لە هەر بوارێك وەستان یان گەندەڵی یان دیاردەی لادان هەبێ ئەوە کەسانی چاکسازیخواز کۆدەکاتەوەو ئەلتەرناتیڤ پێشنیار دەکەن.

چاکسازیی دینی بە نموونە دێنمەوە کە رووی لە چاککردنی ئەرکی کۆمەڵایەتی دین دایە لەو بوارانەی رێگا لە پێشکەوتن بگرێ. ئەوەش بەو مەبەستەیە کەوا هەندێك لە تێکستە دینییەکان پاشەکشە پێبکرێن، لە لێکدانەوەدا گۆڕانیان بەسەردا بێ، لە سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات دووربیخاتەوە. لەم حاڵەتەدا کۆمەڵگا دەکەوێتە قۆناغی دنیایی. لە هەمانکاتدا دین دەتوانێ لە پەیوەندی نێوان پەروەردگار و تاکدا، بە ئەرکی ئامۆژگارییانە و چاکسازییانەی خۆی رابێت.

چاکسازی ئابووری بوارێکی دیکەیە و قۆناغی جیاجیای هەیە. بۆ نموونە لە قۆناغی پێش سەرمایەداریدا ئەرکی لابردنی شێوازی بەرهەمهێنانی فیۆدالییە کە رێگای لە پەیوەندییەکانی ئابووری سەرمایەداریی دەگرێ. کۆتایی بە سیستەمێکی ئابووری بەرهەمهێنانی بچووك دێنێ و رێگا بۆ سیستەمێکی دیکە دەکاتەوە کە لەسەر بنەمای بەرهەمهێنانی فەردی و فراوانە، ئەویش سەرمایەدارییە. لەناو خودی سیستەمی سەرمایەداریشدا کاری چاکسازی تا ئەم رۆژگارە هەر بەردەوامە تا لەگەڵ خواستی نوێی کۆمەڵگاکان بگونجێت. ئەوەش هەر لە قۆناغی گردبوونەوەی سەرمایە دەستپێدەکات تا دەگاتە منافەسەی بێڕەحمانەی سەرمایەدارەکان و سەرهەڵدانی سەندیکا و حزبە کرێکارییەکان و هاتنە پێشەوەی ئەلتەرناتیڤی کۆمۆنیست. سەرەنجام چاکسازی کۆمۆنیزمیشی پێچایەوە و دەرگای پێشکەوتنی زانست و تکنۆلۆژیای کردەوە کە ئەویش لە خزمەتی لێکنزیکخستنەوەی بەرهەمی کاری فکری و دەستی مرۆڤایەتی و بەرزبوونەوەی رادەی بەرهەمهێنان و داهاتنی کۆمەڵگای خۆشگوزەران و سازگار بوو ئەوەش کۆمەڵگای بێ بەش و هەژاری بەجێهێشت.



لە بواری سیستەمی کارگێڕیدا ( بیرۆکراسی) چاکسازی روانگای بەرەوپێشبەرانەی هەیە. بیرۆکراسی لە سەرمایەداریدا هاتەبوون، بۆیە بە دیاردەیەکی ئەو سیستەمە دەژمێردرێ و پەیوەندی راستەوخۆی بە دەوڵەتی هاوچەرخەوە هەیە. پێشکەوتنی تکنۆلۆژیای گەیاندن و راگەیاندن، هاوکاری ئاسانبوونی بیرۆکراسی دەکات و هەوێنی دیموکراسی تێدا دەکاتەوە تا کەسانی لێهاتوو جێگای شایستەی خۆیان بگرن.

سیستەمی سیاسی پێکهێنەرێکی دیکەی کۆمەڵگایە و بە ئاسانی دەکەوێتە ژێر رەخنە، چونکە پەیوەندی بە کار و ژیانی رۆژانەی کۆمەڵگاوە هەیە. گۆڕانکاریی سیاسی لە گۆڕانە هەرە ئاسانەکانە، هەر ئەویش دەرگا بۆ گۆڕانکارییەکانی دیکە دەکاتەوە. کەواتە چاکسازی لە سیستەمی سیاسیدا بە هەنگاوی یەکەم دادەندرێ بۆ ئەوەی ئەویان دەرگا لەسەر گۆڕانکاری ناو سیستەمەکانی دیکە بکاتەوە. هەر ئەو سیستەمەیە ئەگەر چاك بکرێ بناغەی دیموکراسی دادەڕێژێ و هاووڵاتیان لەسەر بەرابەری، ئازادی، هاووڵاتێتی، بەشداریی، هاودەردی و مافەکانی ڕادێنێ. لەوەڕا سیستەم بەرەو روونی (شەفافییەت) و پڕ بەرهەمێتی بڕوات. لێرەوە زەمینەی نەهێشتنی جیاوازی لەنێوان توێژەکانی کۆمەڵ نامێنێ و لەبەرامبەر یاسادا یەکسان بن. پێشکەوتنی دیموکراسی بە گۆرانکاری و چاکسازی بەردەوامی سیاسی دابین دەکرێ.

سیستەمی رەوشتی ناو کۆمەڵگا یەکێك لە سیستەمە گیانسەختەکانە کە پێویستە گۆڕان قبوڵ بکات، بەڵام چونکە ئاسان نییە بۆیە هەمیشە چاکسازیخوازان کاری لەسەر دەکەن. گۆڕان لەو سیستەمەدا بە هێواشی روودەدات. چەمکە رەوشتی (ئەخلاقی)یەکان رەگوریشەی قووڵیان لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵگادا هەیە، ئەویش سەرچاوەکەی کەلتور و مەعریفەی مێژووکردە کە بەشێکی زۆری بۆ باوەڕە دینییەکان و داب ونەریت دەگەڕێتەوە. ئەوانەش لە رێگی سیستەمی پەروەردەوە بۆ وەچەی نوێ دەگوازرێتەوە. ئاستی ساختومانی مەعریفەی کۆمەڵگا کاریگەریی راستەوخۆی





لەسەر دروستبوونی چەمکە رەوشتییەکان هەیە. ئەوە پێشکەوتنی کۆمەڵگایە وادەکات چەمکە رەوشتییەکانی رێگر، پاشەکشە بکەن.

سیستەمێکی دیکەی گرنگ لە چاکسازیدا پەروەردەیە. ئەمەیان هەر لە پەروەردەی ناو خێزانەوە دەستپێدەکا تا پەروەردەی گشتیی ناو کۆمەڵگا و پەروەردەی رەسمیی دەوڵەتی. شێواز و روانگای ئەو سیستەمە کە مەعریفە و زانست بۆ وەچەکانی نوێ دەگوازێتەوە، دەوریان لەسەر زوو یان درەنگ پێشکەوتنی کۆمەڵدا هەیە. هەربۆیە دوای سیاسەت، سیستەمی پەروەردە دووەمین سیستەمە کە دەکەوێتە بەر رەخنەی چاکسازیخوازان. هەربۆیەش ئەو گۆڕانەی بەسەر سیستەمی سیاسیدا دێت، رەنگدەداتەوە سەر سیستەمی پەروەردە. چاکسازییەکانی سیاسی سەرناگرن ئەگەر یارمەتی چاکسازیی پەروەردە نەدەن. چونکە لە رێگای پەروەردەوەیە وەچەی نوێ لەگەڵ چەمك و باوەڕە نوێیەکان شارەزا دەبێت.

ئەوەی ئاماژەم پێکرد گەڕانەوەیەك بوو بۆ سەر واتای چاکسازی و پێکهاتەی هەیکەلە رەخنەگرانەکەی. بەڵام ئەگەر بپرسن لە کوردستان چاکسازی لە کوێڕا دەستپێدەکات؟ ئەم پرسیارە بەجێیە. بۆ وەڵامەکاننی پێویستە ئاماژە بەم بابەتانە بکەین:

١- چاکسازی لەناو حکومەتی کوردستان.
٢- چاکسازی لەسەر ئاستی کۆمەڵگا.
٣- چاکسازی لەو میکانیزمەی مافی جیلی نەخوێندەوار و شێواو دیاریدەکات و دەیپارێزێ.
٤- چاکسازی لە روانگا بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی وەچەی نوێ.
٥- چاکسازی لە سیستەمی سیاسی.
٦- چاکسازی لە سیستەمی پەروەردە.
٧- چاکسازی لە سیستەمی ئابووری.
٨- چاکسازیی ئابووریی لە کەرتی کشتوکاڵ.



٩- چاکسازی لە بەشی گەشتوگوزار وەك بەشێکی گرنگی هەردوو سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی.
١٠- چاکسازی لە زمان و نووسین.
١١- پیشەسازیی کردنی بنەمای ئابووریی کوردستان.
١٢- لێکۆڵینەوەو شارەزابوون لە سایکۆلۆجیای پێشکەوتن.
١٣- رۆڵی راگەیاندن و کاری رۆشنگەریی لە پرۆسەی چاکسازی.
١٤- تێگەیشتن و پێداچوونەوەیەك بە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی.

ئێستا دێمەسەر مانای چاکسازی لە حکومەتدا. ئەم حکومەتە تەمەنی حەڤدە ساڵە، ئەمەش بۆ سیستەمێکی کارگێڕیی تۆکمە زەمانێکی کورتە بۆ پەیرەوکردنێکی بێگەردی دیموکراسی و دامەزراندنی دەزگای بیرۆکراتی و دروستکردنی میکانیزمێك کە شەفافییەتی تێدا بەرقەرار بێ و دەستەبەری بەشداریکردنی هاووڵاتییان لە بەڕێوەبردنی وڵات بکات. ئەم رایەم بۆ پاساو هێنانەوە لەبەرامبەر کەموکوڕیی کارگێڕیی حکوومەت و پاشکەوتوویی کەلتووری و لێنەهاتوویی زۆربەی دەوڵەتمەدارەکانمان نییە کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسمکردووە. تەنیا دەڵێم چاکسازی لەو بوارەدا بریتییە لە روانگای رەخنەگرانە بە سەرتاپای هەیکەلی حکوومەت کە گشت کەموکوڕییەکانی ئەومان نیشان بدات. لەوێدا دەڕوانین ئاخۆ ئەو پێکهاتەیە لە مەنتقدا لەگەڵ هەڵکەوتی کەلتور و جوگرافیای سیاسی ئێمە دەگونجێ یان نا. بە مانایەکی دیکە ئەرێ دامودەزگاکانی بەپێی واقعی کار داندراون یان بۆ رازیکردنی سیاسی و بەرژەوەندی تایبەتی. لەلایەکی دیکە پێگەیاندنی کادری بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ خۆی پرۆسەیەکی دوورودرێژە و بەلانی کەمەوە دەبێ دوو جیل تێیدا بەشدار و هاوکار بن. دروستکردنی کادری بیرۆکرات بۆ بەڕێوەبردنی کارگێڕیی و کادری سیاسی بۆ سەرکردایەتیی دەوڵەت هەر بە دەربڕینی ئاوات و ئارەزوو ناکرێ، چونکە کارێکی قوڵاییە لە چاکسازی و ئامادەسازی کۆمەڵدا. بۆیە

دەبێ ئەو بەشە لە کەلتوری کۆمەڵگا هانبدرێ کە توانایی فێربوون و خۆگۆڕینی هەیە.

ئەگەر کار بەو ئاقارەی سەرەوەدا نەڕۆیشت، ئەوە کەموکوڕیی پەیدا دەبێ و دوایی ئاستەنگ دروست دەبێ، ئەویش دەبێتە مەکۆی زاوزێکردنی توخمی گەندەڵی.

مەبەستم لە بێتەجرەبەیی کۆمەڵی کوردستان، مێژووی کورتی ئەم میللەتەیە لە خۆبەڕێوەبردن و پەیرەویکردنی سەربەخۆیی. تەجرەبە لە سەربەخۆییدا دروست دەبێ. هەر میللەتێك لەوەدا کەمیی هەبوو ئاساییە گەر لەوانی دیکەشدا کەموکاسی هەبێ. گرنگ دۆزینەوەی چارەسەرییە. چونکە لەو حاڵەتانەدا میللەت دەگەڕێتەوە سەر ئەو کارتێکرانەی لە دەوڵەتی داگیرکەرییەوە بۆی بە میرات بەجێماوە. لێرەدایە کە کەرتبوونی کەسایەتی یان شیزۆفرینیای کۆمەڵایەتی تووشی دەبێ. ئەو نەخۆشییە لە ئەنجامی فشاری بێگانە و فشاریی دەروونی خۆی دروست دەبێ. واتە کێشمەکێشی نێوان بێگانەبوون و هەوڵی دۆزینەوەی ناسنامەی خۆی.

بوونی ڕێژەی بەرزی نەخوێندەواری و کەمخوێندەوار، ئاستێکی نزمی توانایی کەلتوریی بۆ پێشکەوتن دەخولقێنێ. لەلایەکەوە مافییەتی وەك خۆی دەیەوێ بەشداری بکات بەڵام لەلایەکەی دیکە بەشدارییەکەی زۆر ئەرێنی (ئیجابی) نابێ. ئەوەش بۆ پێویستبوونی خوێندەواری دەگەڕێتەوە لە پرۆسەی پێشکەوتندا. لێرەدا پێویستە خۆمان لەبەر زۆرانبازیی باوەڕەکان بگرین، بەڵام حکوومەت دەبێ لایەنگری پێشکەوتن بێ. نابێ دیموکراسی و پێشکەوتن بە ئا و نا مامەڵە بکرێ. لەم کارەیدا حکوومەت نابێ دوورخستنەوە و لادانی کۆمەڵایەتی بەکاربێنێ، چونکە ئەوەیان ستەمی لێدەکەوێتەوە.

وەچەی نوێ خەزنەی سەرەکی و لەبن نەهاتووی چاکسازییە کە بە ئاوات و خواستە تازەکانی زەمینەی سوننەت (تەقلید) شکاندن دەرەخسێنن و ئەلتەرناتیڤی لایەنە زیانبارەکانی کەلتوور قبوڵ دەکەن. ئەو وەچەیە داینەمۆی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییە.



لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا بەپێویستی دەزانم بڵێم ئەم کتێبە لە ئەنجامی کێشەی چاکسازی لە کوردستان نووسراوە. پێویستی پرۆسەکە ئەم باسانەی دەسەپاند و لە بۆنەی جیاجیادا پێشکەشم دەکردن. دوایی هەموویان بوونە هەوێن و بەشەکانی ئەم کتێبە.

لە ئەنجامی ئەم بیروڕایانەدا بەشێکی بزووتنەوەی سیاسی لێمکەوتە سەنگەر. شەقام و هەندێك لایەنی زانکۆیی و ئاینییان لێهاندام. لە ئەنجامدا دە هەزار ئیمزایان کۆکردەوە تاکو بدرێمە دادگا، هەروەها ئیسلامییە توندڕۆکانیش مەلاکانی خۆیان لێهاندام و لە مزگەوتەکاندا بەشێك لە وتاری نوێژی هەینییان لە دژی من ڕێکدەخست. بە جۆرێك هەڕەشەی ڕاستەوخۆم کەوتەسەر. بۆیە لە وتارێکی هەفتەنامەی گوڵاندا باسی ئەو گوشارەم کردووە کەوا خەریك بوو بەسەرمەوە دەبووە تیرۆر.

لەم ڕێڕەوەدا ناتوانم باسی هەڵوێستی سەرۆکی کوردستان بەڕێز مسعود بارزانی و سەرۆکی حکوومەتی کوردستان بەڕێز نێچیرڤان بارزانی نەکەم کە ڕاستەوخۆ پشتیوانیان لێکردم و پاراستمیان. ئەگینا بۆ من مستەحیل بوو ئەم نووسینانەم بەسەردا تێپەڕی و ئازارم پێنەگات. بۆیە سوپاسیان دەکەم.

## بەشی یەکەم

### - ئاستەنگەکانی ناو حکوومەت

### - کەلتوری خەڵك

بەرابەریی کۆمەڵایەتی و رەفاهی ئابووری یەکێکە لەو پرسانەی بە شێوەی جیاواز لەلای هاووڵاتیان باسدەکرێ. گەنجەکان زیاتر پێی ماندوون و پتر لێی بەجواب دێن و نارەزایی لەسەر دەردەبڕن. توێژی کەمدەرامەدی هاووڵاتیان سەرەڕای جیاوازی لە توانایی و شارەزاییەکانیان، گوێ بۆ هەموو نارەزاییەك هەڵدەخەن. تەنگوچەڵەمەی کارەبا و ئاو و سوتەمەنی زەمینەی ئەم نارەزاییانەی سەرەوەی خۆشتر کردووە. گرفتی کەلتوریی کوردستان لە بەرێوەبردنی لێهاتوانەی هاوچەرخدا، ئەوە جیا لە بێتەجرەبەیی و کەمپسپۆری، وایکردووە دیاردەی گەندەڵی بەخێرایی سەرهەڵبدات و ئامرازی بەربەستکردنیشی ئاسان نەبێت. حزبە کەمینەکانیش بۆ فراوانکردنی بازنەی نارەزایی، هانی هەموو نوزەیەکی ناڕازی دەدەن.

جیا لەو سەرە قەڵەمانەی ئاماژە پێکران، هێشتا پرۆسەی سەربەخۆیی کوردستان تەواو نەبووە و هەموو رۆژێك بەرژەوەندیەکانی باڵا لەژێر هەرەشەدان و عێراق و وڵاتانی دراوسی لەمپەری بۆ دەنێنەوە. هەربۆیەش گرنگی بزووتنەوەی سیاسی کە پێشینەی شۆڕشگێریی هەیە، وەك خۆی ماوەتەوە چونکە تەنیا حزبە شۆڕشگێرە بە تەجرەبە سیاسی و بەرەنگارییەکانن کە توانایی کۆکردنەوەی خەڵك و تێگەیاندنیان هەیە تاکو دیفاع لە سەربەخۆیی نیشتمان بکەن. لەم رۆژگارەدا هیچ جێگرێك لەم پرسە چارەنووسسازەدا بۆ بزووتنەوەی سیاسی نییە. هەر ئەوەش وایکردووە لە سیستەمی ئیداری و مالیدا ئیمتیازی سەرکردە و کادرەکانی ئەو بزووتنەوەیە ئاسانتر



و زیاتر بێت. لەو ئاسانکارییەدا، بەدکەڵك وەرگرتن و گەندەڵی چ لەناو کادیرانی بزووتنەوەی سیاسی بێ یان لە کەسانی هاوکار و هەڵپەرستی دەوروبەریان، هەیە.

ئەوانە پرسی گرنگن و لەلای هاووڵاتیان بە دەنگی بەرز باسدەکرێن. بۆیە هەوڵدەدەم لەسەریان بکەومە گفتوگۆ بۆ ئەوەی سەکۆی لێکحاڵیبوون فراوانتر بێت.

بەرێوەبەرایەتی هاوچەرخ، دیاردەی تایبەتی قۆناغی پێشکەوتنی تکنۆلۆژیا و سیستەمی سەرمایەدارییە کەوا پێشکەوتنێکی زەبەلاحی کردووەو روویەکی گەش و پێچیدەی سەرمایەداریی جیهانگیرە. تکنۆلۆژیای هاوچەرخ بووەتە بەشێکی هەرەگرنگی سیستەمی بەرێوەبەرایەتی و لێکجیاناکرێنەوە. ئەوەش وایکردووە پێشکەوتنی هەردوو سیستەمی بەرێوەبەرایەتی و کرانەوەی تکنۆلۆژیی پێکەوە بەند بن. لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا کە کوردستان بەشێکە لەوێ، نە سەرمایەداری رێگای پێشکەوتنی بۆ کراوەتەوەو نە فەرمانڕەواییەکانیش تا ئاستی دەوڵەتی مۆدێڕن رێکخران و پێشکەوتن. لەو رووەوە هیچ تەجرەبەیەك لە دیاردەی سیستەمایەتی بەرێوەبردندا نییە و رەگێکیشی لە کەلتوری کۆمەڵگادا دروست نەکردووە. مەبەستم لە چەمکی فەرمانڕەواییەکان، ئیمپراتۆریی عوسمانی و سەفەوی و قاجارییە کە پێکهێنەری پێشینەی فەرمانڕەوایی جیهانی ئیسلامن. دەوڵەتی نوێی عێراق و حکوومەتی کوردستان، دوا لق و پۆپەکانی ئەو کەلتورە سیاسی و بەرێوەبەرایەتییەن.

دەوڵەتی دەستکردی عێراق، بە شێوەی سەپاندن و توندوتیژیی دروست بوو و یەکێکە لە کارە فاشیلەکانی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیز. خودی عێراق و شاری بەغدا بەتایبەتی، لانکەی ئیمپراتۆرییەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامن، جا کاتێك ئەوێ بووە نموونەی باڵادەستی دەوڵەتی نوێ ئەوە کەلتوری فەرمانڕەواییەکەشی دەستی بە ژیانەوە کرد. دەوڵەتی دروستکراوی عێراق جیا لە چەك و تەقەمەنی هیچی دیکەی لە مۆدێرنیزمی کۆلۆنیالیی وەرنەگرت، هەربۆیەش پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەدیت. کاتێك لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەو دەوڵەتە لەسەر دەستی ئەمریکاو بریتانیا و کوردستان، روخێندرا، شتێك بەناوی کەلتور و تەجرەبەی بەرێوەبردن خۆی نیشان نەدا.





کوردستان خاوەنی مێژووی سیاسی بە مانای دەوڵەت بەڕێوەبردن نییە، بۆیە دەکرێ چەمکی بێ مێژوویی بۆ بەکاربێنین. کورد مێژوویەکی لکێندراو بە کەلتورە گەورەکانی دراوسێی هەیە کە هەموویان خاوەنی فەرمانڕەوایی خۆیان بوون و کوردیان بەخۆیانەوە لکاندووەو هەوڵی تواندنەوەیان داوە. بۆیە کورد جیا لە بەرەنگاریی و پاراستنی زمان و هەندێك داب و نەریت، شتێکی دیکەی پێنەکراوە. نە جۆری فەرمانڕەوایی بەڕێوەبردن و دوایی دەوڵەت بەڕێوەبردنی ئەو کەلتورانەی باڵادەستی دراوسێ، نەهاتۆتە ناو کەلتوری گەمارۆدراو و تەپەسەری کوردەوە. تەنانەت شێوەی میعماری و ڕێگوبان و شێوازی ئاودێریش لەلایەن داگیرکەرانییەوە نەخشەی بۆ دەکێشرا. مێژووی سیاسی ئێمە لە شەڕو بەرەنگاریی چەند ئیمارەتێك و خەباتی قۆناغی نەتەوەییخوازی زیاتر نییە. دوایی دێمەسەر باسی دوای ڕزگاریمان لە باشوری کوردستان و دروستبوونی حکوومەتێکی نەتەوەیی لەژێر ناوی هەرێمێك لە عێراق.

لە پێشەکی ئەم نووسینەمدا، یەکێك لەو باسانەی بە پێویستی دەزانم ئاماژەی پێبکەم، چەمکی یاسایە. ئەم چەمکە هیچ پێشینەیەکی لە کەلتور و تەجرەبەی سیاسی و شێوازی فەرمانڕەوایەتی و بڕوا ئاینییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا نییە. ئەگەر حسابێك بۆ ئەم دەڤەرە بکەین کە لانکەی داهێنانی زۆرترین دینەکانی جیهانە و هەرسێك دینی ئاسمانی و جیهانگیر (جو، مەسیحی، ئیسلام) لە سەر ڕووبار و کەند و شیو و بیابانەکانی ئێرە سەریانهەڵداوە، تێدەگەین کە بڕوای ئاینی تا چەند کاریگەریی لە پێکهاتنی کەلتوری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیدا هەیە. لە هەموو ئەوانەی ئاماژەم پێدان، چەمکی یاسا کە بەدەستی مرۆڤ دادێت، نەك نییە بەڵکو قەدەغەش بووە. ئەوەی لە ڕۆژگاری زۆر سەرەتایی پێکهاتنی کۆمەڵگاکاندا، حامورابی نزیك بە شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا وەك یاسا نووسییەوە، تەنیا بۆ یادگار مایەوەو لەلایەن کۆمەڵگا ئاینییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوتە ناو جوغزی بیروباوەڕی بتپەرستی (وەسەنی).



فەرمانڕەواکان (کە هیچ سیستەم و شێوازی دەوڵەتیان پێوە نەبوو) لەسەر بڕیاری شەریعەت بەڕێوە دەچوون و جیا لەوە شتێکی نووسراوەی دەستی مرۆڤیان قبوڵ نەبوو. بۆیە یاسا بە جۆرێك لە بیدعە دادەندرا و بە چاوی قەدەغە و حەرام تەماشای دەکرا. فەرمانڕەوایی ئاینی ئیسلام هەموو کەلتورەکانی حامورابی و یۆنانییەکان و ڕۆمییەکان و ساسانییەکانی سڕیەوەو بە حەرامی دانان. لە زەمانی ئەمەوی و عەبباسیەکانیشدا چەندین جار بیروباوەڕی فەلسەفیی و لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی قەڵاچۆکران و سەرەنجام ئاسەواریان نەما. بۆیە چەمکی یاسا لە کەلتوری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕستدا جێگای نییە و لەناو کوردیش هەروایە. کاتێك چەمك لە کەلتوردا نەبوو، ئەوە لە پێکهاتەی بڕوا و سایکۆلۆجیای تاکیشدا وجودی نابێت. کەسایەتی مێژوویی ئێمە چەمکی یاسای تێدا نییە.

لەو کۆمەڵگایانای دین بنەمای فەرهەنگ و سیستەمی بەڕێوەبردنی فەرمانڕەوایی بووە، زەمینەی نوێبوونەوە زۆر زەحمەت دەرەخسێ، بۆیە هەموو بیر و هەوڵێکی تازە ڕەتدەکرێتەوەو زەمینەی ئەوە هەیە بە ئاسانی تێکبشکێندرێت. ئەو واقیعە وایکردووە شێوازی توندوتیژیی هەمیشە لەبەردەستان بێت و لە هەموو بوارێکیشدا بە ئاسانی پاساوی ئاینی بۆ بهێندرێتەوە. بۆیەش هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتی لادەرانە و تاکڕەوانەی خەلیفە و سوڵتانەکان پاساودراون. بۆ نموونە ناکۆکی نێوان هەردوو خەلیفە عوسمان و عەلی، سەرەنجام کوژرانی هەردووکیان بێ دەنگی لێدەکرێ، کوشتاری بنەماڵەی پێغەمبەری ئیسلام بە دەستی یەزید لەلای فەرمانڕەوا سوننیەکان ئاسایی بوو. یەکدی کوشتنی باوك و کوڕ و براکان لەناو خەلیفەکانی عەباسی و سوڵتانەکانی عوسمانی باو بوو، کەچی فتوای حەرامی لەسەر دەرنەکرا.

ئەو داب و نەرێتە پاساودراوانە بوونە سەرچاوەی توندوتیژییەکی بێهاوتا لەکاتی خۆیدا، بەتایبەتی لەنێوان لاباڵ و مەزهەبە جیاوازەکان. ئەوە تا ئێستاش بەردەوامە. بۆیە دەکرێ بڵێین توندوتیژیی ڕەگوڕیشەی لە کەلتوری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە. جا

لە هەر شوێنێك ئەو کەرستە کەلتوریە هەبێ، زەمینەی بەدکەڵکوەرگرتن و گەندەڵی زۆر بە ئاسانی دەڕەخسێت. توندوتیژی جۆرێکە لە لادان، گەندەڵیش هەروایە، کەواتە دەکرێ دیاردەی جاشایەتیش لەناو کوردستاندا وەك جۆرێك لە لادان بژمێردرێت.

لەم روانگایەوە دەکرێ بیر لە چاکسازی هەموو دیاردە و سیستەمەکانی ناو کۆمەڵ بکەینەوەو رەخنەگرتن لە پێکهاتەکانی کەلتوری کۆمەڵگا قەدەغە نەکەین. ئاین یەکێکە لە سیستەمە فراوان و کاریگەرەکانی کەلتور کە توانایییەکی زۆری لە بەردەوامی و توناوتونیتیدا هەیە. بۆیە کوردستان بەرەوپێشەوە ناچێ ئەگەر رۆڵ و پێگەی دین لەگەڵ ئەم رۆژگارەدا نەگونجێندرێت. بۆیە چاکسازی لە پەل و پۆ هاویشتنی دین بۆ بوارەکانی سیاسەت و پەروەردە و ئازادییەکانی تاك، زەرورەتێکە و چاکسازی گشتیی کۆمەڵگا بەندە بەوەوە.

چاکسازی (ریفۆرم) کردەوەیەکی رەخنەگرانەی بنیادنەرانەیە، دەکرێ لە بواری جیاجیادا بەکار بێت. ئەوەش پێویستییەکانی رۆژگار و خواستەکانی پێشخستنی کۆمەڵایەتی دەیهێنێتە پێشەوە. لەم حاڵەتەدا زەمینەی کۆمەڵایەتی بۆ گوێگرتن و بەشداریکردن دەڕەخسێت. بەم جۆرەیە کە بزاڤی رۆشنگەری دەستپێدەکات و رۆڵی روناکبیران و بیرمەندان بایەخی دەبێت. لە دروستکردنی رایەکی گشتیی پشتیوان بۆ ئەم پرۆسەیە هەموو کەس دەتوانێ جێ پەنجەی هەبێت.

تەجرەبەی مرۆڤایەتی لە کاری چاکسازیدا گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی هەیە کە دەکرێ پشتی پێببەستین. دەوڵەتان و رێکخراوە نێونەتەوە هاوچەرخەکان ئەزموون و میکانیزمێکی فرەیان هەیە کە بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەوانە هەموویان، مەحاڵە چاکسازی تەنیا بە فکر و ئەزموونی خۆیی بە ئەنجامی سەرکەوتوو بگات.

ئەو راستیە، لە بواری میکانیزم و پەرەپێدانی کردەوەی چاکسازیدا، چ وەك رۆشنگەریی چ وەك گۆڕانکاری، لایەکی دیکەمان نیشاندەدات ئەویش رۆڵی سەرکردایەتی چاکسازیخوازە. هەبوونی سەرکردەی خاوەن هەیبەت و متمانەی کۆمەڵگا کە باوەڕی بە چاکسازی هەبێت و بە پێویستیی چاولێنەپۆشراوی گۆڕانکارییە بنەڕەتییە



دەستنیشانکراوەکانی بزانێ، زەرورەت و تەواوکاری کردەوەی چاکسازییە. ئەگەر سەرکردەی چاکسازیخواز نەبێت، بزووتنەوەی رۆشنگەریی و خواستی خەڵك بە تەنیا ناگاتە ئەنجامی تێروتەسەل. ئەم دووانە تەواوکاری یەکترن. هەڵبەت کاتێك زەمینەی گۆڕانکاری و چاکسازی خۆش نەبوو، ئەگەر سەرکردەی چاکسازیخواز هەشبێت، ناتوانێ هەر بە ئیرادەی خۆی کۆمەڵگا بگۆڕێ. بۆ نموونە مەئمونی خەلیفەی عەباسی و ئەمیر کەبیری سەدری ئەعزەمی زەمانی ناسرەدین شای قاجاری و عەلی ناسر محەمەدی سەرکۆماری یەمەنی باشوور، لەو سەرکردانەن کە نەیانتوانی چاکسازی پەرەپێبدەن و خۆشیان لەو پێناوەدا کردە قوربانی.

لە کوردستاندا، سەرۆکایەتی حکوومەت خوازیاری چاکسازییە و دەیەوێ دامودەزگاکانی حکوومەت و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەرەو پێشکەوتن پاڵ بنێت. سەرۆکی کوردستان مسعود بارزانی، دوور لە ئینتیمای حزبایەتی، کۆکەرەوەی ئیرادەی سیاسییە لەو پێناوەدا، خۆشی بەو کەسایەتییە موعتەدیلە خاوەن کاریزمایەی، باوەڕی بە خۆگونجاندنی هەموو سیستەمەکانی پێکهێنەری کەلتوری کوردستان لەگەڵ پێویستییەکانی پێشکەوتنی ئەم رۆژگارە هەیە. ئەوەش هەر لە حکوومەتەوە تا دەگاتە ئاین و داب و نەریت و بە پیشەسازیکردنی وڵات، دەگرێتەوە. ئەو کەسایەتیانەی مەسعود بارزانی لە سەرکردایەتی کوردستاندا پشتیان پێدەبەستێ هاوکار و ئاسانکاری ئەرکەکانی سەرۆکی کوردستانن، کەسایەتی ناودار و کاریگەری وەك، نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکوومەتی کوردستان و سەرکردەی کاریگەری ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی تێدایە بۆیە دەکرێ هەموومان بە گەشبینییەوە بەشداری لە پرۆسەی رۆشنگەریدا بکەین ئەوەش بە هیوای دەستپێکردنی کاری مەزن و مێژووییانەی چاککردنی کۆمەڵگای کوردستان.

**١- مونافەسە و جیاوازی:**

لە هەر وڵاتێکدا نەیار و نارازی نەبن، گومانی تێدانامێنێ کەوا ئازادی پێشێلکراوە و سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵاتیش دیموکرات نییە. هەبوونی دیموکراسی وا ناگەیەنێ کە هاووڵاتیان بە تێکڕا لەسەر پرس و پرۆژەکانی ناو وڵات کۆك دەبن. بەپێچەوانەی ئەوەوە دروستە، ئەویش یەکدەنگی کارێکی مەحاڵە. هەمیشە دەبێ زۆرینەیەك دروست ببێت کە لە هێڵە گشتییەکاندا کۆك بێت و دیفاع لە باڵی دەسەڵاتداری هەڵبژێردراو بکات. هەڵبەت دیفاعێکی بەشەرت و یاسایی نەك کوێرانە. لە پاڵ ئەوەشدا کەمینەی نارازی دروست دەبێ کەوا بە پرۆژەی باڵی دەسەڵاتداری هەڵبژێردراو رازی نییە چونکە پرۆژەی دیکەی پێیە و هەوڵدەدات لە هەڵبژاردنی ئایندەدا کورسی دەسەڵات وەربگرێ و دەست بەو رەوتە بکات کە لای خۆی گەڵاڵەی کردووە. ئەمە پێکهاتە و پێناسەی سیاسی هەر نیزامێکی دیموکراتە.

هەر لەوەشەوەیە سیستەمی دیموکراسی یەکدەنگی تێدا دروست نابێ، ئەگەر ئەو یەکدەنگییە دروستیش بوو ئەوە تەنیا لەسەر بەرژەوەندی باڵای نیشتمان دەبێ کە زەمانەتە بۆ بەردەوامی نیزامی دیوکراسی و پاراستنی سەربەخۆیی نیشتمان. نەیاری لە سیستەمی دیموکراسیدا بە یاسا رێکدەخرێ و نارازییەکان دەبێ لە چوارچێوەی یاساکاندا چالاکی خۆیان رێکبخەن و بە شێوازێکی هاوچەرخ و گونجاو لەگەڵ سروشتی کەلتوری وڵاتەکەیان گفتوگۆ بکەن. نارازییان کاتێك ویستیان رەخنە لە باڵی دەسەڵاتدار بگرن دەبێ بەڵگە و مەنتق بەکاربێنن و ماف وبەرژەوەندییە رەواکانی کەسانی دەسەڵاتدار و لایەنگرەکانیان بە بیانوی رەخنە و نەیاریی ( موخالیف) پێشێل نەکەن، چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەوانیش هاووڵاتین و یاسا لە کاتی پێویستدا دیفاعیان لێدەکات. هەر لەوەشە ئەندامێکی نارازیی کەمینە بۆی نییە بە کەیفی خۆی پەلاماری سەرۆك، وەزیر، پەرلەمانتار، بەڕێوەبەر، کارمەند یان لایەنگر و لێپرسراوی حزبێك بدات کە دەسەڵاتی بە هەڵبژاردن وەرگرتووە. ئەگەر یەکێك ویستی رەخنە لە پرۆگرامی حکوومەت بگرێ ئەوە دەبێ خۆی ماندوو بکات تا



بەڵگەی مەنتقی وەدەستبێنێ، بۆ رەخنەگرتن لە وەزیر و بەڕێوەبەرێك یان چاودێریکردنی ژیانی تایبەتی و مالیی، ئەوە پێویستە دیسان بەڵگەکانی خۆی رێکبخات و بەپێی یاسا بکەوێتە چالاکی موخالیفانەی خۆی و وریا بێت هەر لەخۆیەوە بەبێ پاساو قسە و رەفتار نەکات چونکە دەبێ بزانی وەزیر و بەڕێوەبەر و لێپرسراوێکی حزبیش مافیان پارێزراوە، وەك هەر هاوڵاتییەکیش پایەی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی رەوای خۆی هەیە و یاسا بۆی دەپارێزێت. دەبێ بزانین یاسا دیفاع لە هاووڵاتیانی دەسەڵاتداری هەڵبژێردراویش دەکات و رێگا نادات ئەوانەی کە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات زۆرینەیان بەدەستهێناوە پەلاماربدرێن. چونکە ئەگەر وانەکرێ ئەوە هیچ کەس ناتوانێ کاتێك متمانەی زۆرینەی هاووڵاتیانی وەرگرت، دەستبەکار بکات، لەبەر ئەوەی هەموو ساتێك لەژێر هەرەشەی پروپاگەندەو بروبوختانی نەیاران دەبێت. ئەوەش کۆتاییەکەی بە ئاژاوە و بێنەزمی دێت. جا یاسا کاری ئەوەیە نەیەڵێ ئاژاوە هەبێت و بەرژەوەندییە رەواکان دەپارێزێت.

لە سیستەمی دیموکرسیدا کاتێك یاسا لە سەرپێچیکارێکی ترافیك یان تاوانکارێك یان لادەرێك دەپێچێتەوەو ماف بۆ خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە ئاوهاش مافی دەوڵەمەندێکی زۆر ساماندار لەبەرامبەر دەستدرێژیی ماددی و مەعنەوی کەسانێکی زۆر هەژار دەپارێزێ. ئەوە لە کاتێکدا بیانەوێ پەلاماری بەرژەوەندییەکانی بدەن. چونکە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی دیموکراسی، کێبەرکێ و مونافەسەی ئازاد و پاکە. ئەو مونافەسەیە سیاسەت و داهێنان و سامان و ئیعتباری کۆمەڵایەتیش دەگرێتەوە. چونکە سەلمێندراوە مرۆڤەکان لەو بوارانەی سەرەوەدا یەکسان نین و توانایی و شارەزاییەکانیان وەك یەك نییە. بۆ نموونە دوو کەس لەسەر سەرۆکایەتی مونافەسە دەکەن یەکێك لەو دووانە هەموو پێوەر و تواناییەکانی سەرۆکایەتی تێدا هەیە و خەڵك متمانەی دەدەنێ، بەڵام ئەوەی دووەم پێوەر و تواناییەکانی کەمن و متمانە وەرناگرێ، بۆیە دەکرێ هەر موخالیف بێ بەڵام دەبێ رێزی یاسا بگرێ و سەر بۆ متمانەی زۆرینە دانوێنێ. یان لەوانەیە دوو کەس لە بواری ئابوریدا کار بکەن، بەڵام یەکێك لەو دووانە





شارەزایی و هونەری سامانداری بزانێ بۆیە زوو دەوڵەمەند دەبێ. لە هەمانکاتدا کەسی دووەم لەوانەیە زۆریش خۆی ماندوو بکات بەڵام تێدەشکێت یان کەمتر دەوڵەمەند دەبێ یان لەوانەیە باری دارایی تووشی تەنگژە بێت. لێرەدا تێشکاو بۆی نییە بەرژەوەندییەکانی منافیسەکەی بە نایاسایی بخاتە مەترسییەوە.

لەوانەیە لێمبپرسن ئەدی دادپەروەری (عەدالەت) چۆن دابین دەکرێ کە ئەو هەموو لەمپەرانە لەبەردەم نەبراوەکان دابندرێت؟ لە بەشێکی ئەم نووسینەمدا بەتێری باسی ئەوەش دەکەم.

لە کوردستانی ئەمرۆدا ئەو چەمکانەی باسمکردن پێویستیان بە روونکردنەوە و گونجاندن هەیە تا لەگەڵ پرۆسەی گەشەسەندنی دەزگاکانی دیموکراسی و ئەرکەکانی حکوومەت و خواستی هاووڵاتیان و پاراستنی مافی نەیاران یەکبخرێ و بەشێوەیەکی ئاسایی هاوکاری و جیاوازی لە نێوان تیپە جیاجیاکانی کۆمەڵگادا، چوارچێوەی یاسایی وەربگرێ. کۆمەڵی کوردستان لەم بوارەدا تازەکارە و پێشینەیەکی لەم بابەتەی نییە. ئەوە وایکردووە ئازادی لەگەڵ بێنەزمی و ئاژاوە تێکەڵ بکرێ. بۆ نموونە هەندێك گەنج دەنووسن:"چۆن مافمان نەبێ لەکاتی خۆپیشاندانندا دامودەزگاکانی حکوومەت و مڵکی هاووڵاتیان بسوتێنین"؟! یان دەڵێن "لەداخی سەیارەو ئیمتیازی لێپرسراوانی حکوومەت خەریکە سکمان بتەقێ"!

ئاشکرایە وەختی ئەوە هاتووە هەموو پرسیارێك بکرێ و مناقەشەکردنی هیچ بابەتێکیش قەدەغە نەبێ. جا ئەوە لەسەر خزمەت یان بێتەجرەبەیی دەزگاکانی حکوومەت بێ یان کەموکاستی کەلتور و رۆشنبیریی گشتی کۆمەڵ بۆ قۆناغی دەوڵەتی سەربەخۆبێ یان بەدحاڵیبوونی توێژێکی دیاریکراو بێت. لە کۆتاییدا دەست و دەنگی نەیارانی دەرەوەش کە دژایەتی کوردستان وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ دەکەن بە ئاشکرا دیارە بەڵام نابێ نارەزایی ناوخۆ لەگەڵ شانتاژ و جەنگی دەروونی بیانی تێکەڵ بکرێ.



**٢- ئایا حکوومەت هەمیشە خزمەتگوزار بووە؟**

کورد یەکێکە لەو میللەتە دەگمەنانەی جیهان کە بەدێژایی مێژووی خۆی ژێردەستە بووەو قەت خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبووە، هەربۆیەش هیچ تەجرەبەیەکی لە بەرێوەبەردنی دەوڵەتدا نییە. ئەم حاڵەتەی ئێستا بەدەردەکەوێ کە مافی خۆبەرێوەبردنی وەدەستکەوتووە. لە کەلتوری ئەم میللەتەدا داب و نەرێت و رەسمی دەوڵەتداری بزرە و هیچ کەس لەم بوارەدا پێشینەیەکی نییە. حکوومەتی عێراقیش سیاسەتێکی جیاوازیکارانەی نەژادپەرستی لە دەزگاکانی داگیرکەری خۆی لە کوردستاندا پەیرەوکردووە و پۆستە سەرەکییەکانی هەمیشە بە کەسانی عەرەب سپاردووە. هەڵبەت پۆستەکانی جێبەجێکاری خوارەوەی بەرێوەبەرایەتی لەدەست کوردەکاندا بووە کە ئەوانیش ئەڵقەلەگوێی سیاسەتی داگیرکەر بوون و زوو زوو دەگۆردران.

دوای ساڵی ١٩٩١ کە حکوومەتی عێراق ناچارکرا دەزگاکانی لە کوردستان بکێشێتەوە، کلۆڵی و لێنەهاتوویی ستافی بەرێوەبەرایەتی داگیرکەر دەرکەوت. ئینجا ئەگەر لەوەش بگوزەرین، ئەوە حکوومەتی عێراق بەدرێژایی مێژووی خۆی، نەبووە خاوەنی دەزگای هاوچەرخ و لە بەشە عەرەبیەکەشیدا پێشکەوتنێکی ئەوتۆی نەکردبوو. ئەوەی عێراقی بەرێوەدەبرد ئەفسەرە کودەتاچییەکانی سوپا بوون کە بچووکترین تەجرەبەیان لەم بوارەدا نەبوو، نەشیانهێشت تەجرەبەیەکی لەم بوارە دروست ببێت. نووسەری عەرەبی عێراقی حەسەن عەلەوی دەڵێ: خێڵە بەدەوییەکان عێراقیان بەرێوەدەبرد بۆیە شارستانییەتیان کوێرکردەوە."دولە الرعب".

حکوومەتی کوردستان ناچار بوو لە بێتەجرەبەیی خۆیدا مل بداتە دروستکردنی دەزگاکانی حکوومەتی و مەدەنی. لەم پێناوەدا ئابلوقەی ئابووری و ئیداری عێڕاق و نێودەوڵەتی بوونە ئاستەنگی قوڕسی بەردەم ئەم پرۆسەیە. کەمی داهات و ناکۆکی و شەڕی ناوخۆ هەربەجارێك خێرایی پێشکەوتنەکەیان شل کردەوە. سەرباری ئەوەش روانگای حکوومەت لە بەڕێوەبردندا بریتی بووە لە خزمەتگوزاری. حکوومەتی





خزمەتگوزار جیا لە دابینکردنی ئاسایش و پاسەوانیکردن لە بنەماکانی سیستەمی دیموکراسی، دەبێ بوارە سەرەکییەکانی خزمەتکردنی هاوولاتیان بەدەستەوەبگرێ کە لە ولاتی ئێمەدا بریتین لە: ئاو، کارەبا، خزمەتە شارەوانییەکان، رێگاوبان، تەندروستی، پەروەردە.

حکوومەتی داگیرکەری عێراق نەك هەر ئەزموونی بەرێوەبەرایەتی بۆ بەجێنەهێشتین بەڵکو ئەم بوارانەی سەرەوەشی بە چەشنێکی ئەوتۆ سەقەت و شێواندبوو کە راستکردنەوە و پێشخستنیان کارێکی ئاستەم بوو،نەك هەر ئەوە بەڵکو سەرمایەیەکی ماددی و مرۆیی ئامادەکراویشی دەویست. حکوومەتی کوردستان هەردوو سەرمایەکەی بە تەواوەتی نەبوو. هەڵەی حکوومەت لەوەدابوو کە هاوولاتیان نەدەخستەبەردەم گرفتەکان و تێینەدەگەیاندن کە ئەم بوارانە، دابینکردنیان زەمان و توانایی دەوێ. ئەو کارەبا و ئاوەی کە لە سیستەمی خۆیدا عێراق بە هەڵەیی و سەقەتی هێنابووی و دوایی تێکیدان، نەك هەر سەرمایە بەڵکو هاوکارییەکی نێودەوڵەتی پێویستە تاکو لەنوێ دادەمەزرێ و سەرچاوەکانی وزەی بۆ دابیندەکرێ. واتە دەبوا ئابلوقەی نێودەوڵەتی هەڵگیرێ و حکوومەتی عێراقیش بە یاسا رێگەبدات تاکو کۆمپانیاکانی دەرەوە هاوکاریمان بکەن.

بەپێچەوانەکەی روویدا، حکوومەت بۆ دابینکردنی سەرکەوتن لە منافەسەی حزبی ناوخۆییدا دەهات گفتی چارەسەرکردنی دەدا. ئەمە هەڵەیەکە هاوولاتی بەسەهو دەبرد. بۆ نموونە لەم ساتەدا دابینکردنی کارەبا پێویستی بە سوتەمەنی هەیە، ئەویش عێراق و ئێران و تورکیا هەریەك بە دەوری خۆی ئاستەنگ دروست دەکات، چونکە نایانەوێ لە تەنگوچەڵەمە دەربچین. بۆیە سەرچاوەکانی وزەمان لێدەبرن. بۆ خۆشمان ئەو ژێربەنا تکنۆلۆژییەمان نییە نەوتی خۆمان بۆ پێویستییەکانی ناوخۆ بپاڵێوین. ئەمە گرفتێکی سیاسییە و دەبێ خەڵك لێی ئاگاداربکرێت. بەداخەوە لەم بوارەشدا حکوومەت فێری شەفافییەت نەبووە.



سەربارى ئەوەش حکوومەت ئەوەی لە توانایدابوو کردوویەتی جا با کەموکوڕیشی هەبووبێت. بۆیە بەرامبەر بەو رێبازە خزمەتگوزارییەی رایگەیاندووە وەفادار بووە.

دابین کردنی عەدالەت لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بە یاسا ئەرکی حکوومەتە. بەڵام کام عەدالەت؟ چۆن تێیدەگەین؟ ئایا عەدالەت بەو مانایەیە کەوا هاوولاتی لەسەردەمی ئازادیدا پاڵبداتەوەو حکوومەت خۆشاوی بەزاردا بکات و بەبێ کارو بەرهەمهێنان بە پارەی نەوت بیژێنێ؟ یان سەرچاوەکانی ئابووری ولات ببوژێنێتەوەو برەو بە پەرەسەندنی تکنۆلۆژیا بدات و بەوەش دەرفەتی کار بۆ هاوولاتیان زۆر بکات تاکو بێکاری نەمێنێ و خەڵك لە کەلتوری تەمبەڵی و پشتبەستن بە پارەی وردەمعاش کە بەبێ هۆ وەریدەگرێت، دوور بخرێتەوەو دەسحەقی چاك لەبری بەرهەمی چاك وەربگرێ؟ دەبێ روونی بکەینەوە عەدالەت بەکام مانایە؟

بەباشیدەزانم ئاماژەیەك بە رەگوریشەی چەمکی عەدالەت لە رۆژهەلات بکەم. لە دوو حاڵەتدا ئەم چەمکە بەرزدەکرێتەوە:

**یەك:** لەکاتێکدا پاشکەوتن و هەژاری بلاوبووبێتەوە( جا بە هەر پاساوێك بێت). لە سەردەمی نەبوونیدا فکری دادپەروەری بەمانای زۆر سادە پەرەدەستێنێ ئەویش لەوەدا خۆی تەعبیر دەکات کە نان و خانو و ئاسایش بۆ هەمووان پێویستە، بۆیە رق و کینە بەرامبەر سەرمایەداران و لێپرسراوانی حکوومەت برەوی پێدەدرێ و هەندێك شێوەی جیاجیای ئایدیۆلۆژیا لەم بوارەدا دەکەونەکار و کەسبی حزبایەتی پێدەکەن. چەمکی سادەی عەدالەت لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئەوروپا گەیشتە لوتکە و سەرەنجام زنجیرەیەك شۆرشی سۆسیالیستی سەریانهەڵدا کە لە هەموویان کاریگەرتر شۆرشی ئۆکتۆبەری روسیا بوو. دوایی لە ئەنجامی پەیدابوونی بزووتنەوەی دژی کۆلۆنیالیستی و رزگاریخوازی گەلانی رۆژهەلات وکاریگەری ئایدیۆلۆژیی و سیاسی یەکێتی سۆڤیەت لەسەر ئەو بزووتنەوانە، فکری عەدالەتی سادەیی بە قووڵی هاتە ناو ئایدیۆلۆژیای رزگاریخوازی و لە پرۆسەی شۆرشگێریدا خەڵکی پێگۆش دەکرا. جا پاشکەوتن و هەژاری لە رۆژهەلاتدا بۆ خۆشی زەمینەیەکی لەبار بوو بۆ ئەوەی





ئاسانتر پێشوازی لەم چەمکە بکرێت. چەند نموونەیەك دێنمەوە: سادەیی لە تێڕوانینی عەدالەتدا لەلای چینی و کەمبۆدییەکان بووە مایەی سەندنی گیانی چەندین ملیۆن مرۆڤ و ڕێگاگرتن لە منافەسەی کار و ئابووری، دابەشکردنی سامان بەبێ فەرق و جیاوازی لەناو خەڵك. ئەنجامی ئەوە بووە دابەشکردنی هەژاری بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر هاووڵاتیاندا. ئەم دابەشکردنە سادەیە پاڵنەری داهێنان و منافەسەی فەردی نەهێشت و پێگەی تاکی لە کۆمەڵدا کوێرکردەوەو لە بۆتەی کۆمەڵدا تواندیەوە. هەربۆیەش شتێك بەناوی ئازادی و دیموکراسی پەرەی نەسەند. جا ئەمەش میکانیزمی سیاسی و دەوڵەتی خۆی بەدواداهات کە حکوومەتی دیکتاتۆری ڕەش بوو. هەر ئەوەش وایکرد تا ئەم دەیەی دوایی شتێك بەناوی دیموکراسی و پێگەی تاك لە ڕۆژهەڵاتدا بوونی نەبوو.

**دوو:** جیا لەو تاریفەی سەرەوە، پێناسەیەکی دیکەش بۆ چەمکی عەدالەت هەیە کە بریتییە لە ڕوانگایەکی واقیعبینانەی ئینسانی بۆ ئاسایش و پێشکەوتنی کۆمەڵگا. ئەم ڕوانگایە هەموو بوارەکانی یاسایی و مافەکانی مرۆڤ و ڕەخساندنی دەرفەتی گونجا و بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵ، سیاسەتێکی گونجاو بۆ پێشکەوتنی ئابووری و بوژانەوەی تیکنۆلۆژی و دانانی سنووریك بۆ کەمدەرامەتی و بە هانا وەچوونی لێقەوماوان و گرتنەبەری ستراتیژییەکی ڕوون بۆ دەستەبەرکردنی خانو و خزمەتگوزارییەکان و پەروەردە و فێرکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی تەندروستی و خولقاندنی کەش و دەرفەتی گونجاو بە یەکسانی بۆ هەموو هاووڵاتیان، تاکو بەشداری پرۆسەی سیاسی بکەن و پۆستە ئیدارییەکان بەپێی لێهاتوویی بۆ هەمووان کراوە بێت. ئەم ڕوانگایە بەپێی یاسا دابین دەکرێ و حکوومەت ناچارە هەنگاوی بەکردەوەی بۆ بهاوێت. لێرەدا حکوومەت و کۆمەڵگا زەمینەی پێگەیشتن و ئامادە بوون بۆ هاووڵاتی دەرەخسێنن و دەرگای بەشداریکردن لە کارو بەرهەمهێنانی بۆ دەکەنەوە. بەڵام شتێك بەناوی دابەشکردنی نان و پێدانی معاش بەبێ ئیشکردن بوونی نییە. ئەم



چەشنە عەدالەتە بەرهەمی کۆمەڵگا پیشکەوتووەکانە و لە ئاکامی لیکۆڵینەوەی ورد دیاریدەکرێ. لەوێدا سۆز و عاتیفەی ساکارانە جێگای نابێتەوە.

حکوومەتی کوردستان بۆ خەملاندنی ئەم ڕوانگایە کاریکردووە و دامودەزگای تایبەت بە خۆی بۆ دامەزراندوون بەڵام تازەیی پرۆژەکە لەلای هاووڵاتیان و ساوایی دەزگا و کادری ئیدارییەکە بەرهەمێکی ئەوتۆی نەداوە. بۆیە گومانی تێدا نییە کە حکوومەت لەم ڕوانگایەوە هەنگاوی بەرەو خزمەتگوزاری هاویشتووە. کامڵکردنی ئەو بوارە خزمەتگوزارییانە بە یەکلایەنی هەر بە حکوومەت ناکرێ بەڵکو هاوکاری هاووڵاتیانیشی پێویستە. ڕێژەی بەرزی نەخوێندەواری، ئینجا ئاستی نزمی لێهاتویی زانستی و تکنیکی ئەو بەشە کە خوێندەوارە، سەلبیانە بە سەر پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە، فراوان بوون و گەشەسەندنی دەزگا خزمەتگوزارییەکاندا، شکاوەتەوە. بۆیە نابێ تەنیا داخوازی خەڵك لەبەر چاو بێت بەڵکو ئامادەیی کەلتوریی هاووڵاتیانیش بۆ ئاوێتەبوون و یەکانگیربوون لەگەڵ پرۆژەکان و بەرزبوونەوەی ڕێژەی کاردەیی بەشداربوونیان، لایەنێکی گرنگی تەواوکردنی ئەو پرۆژانەیە. ئەوەش جیا لە خۆتەرخانکردنی حکوومەت، زەمانی پێویستە تاکو خەڵك لەسەر کار و بەرهەمهێنان و بەشداریکردنی چالاکانە رادێت.

### ٣- ئایا سیاسەتی پێگەیاندنی کادری بەڕێوەبردن هەیە؟

حکوومەتی کوردستان جیا لە کێشە سیاسی و سوپاییە ناوخۆ و دەرەکییەکانی، تووشی گرفتێکی سەخت بوو، ئەویش نەبوونی کادری ئیداری لێهاتووی زانستی و بەکردەوە بوو. کوردستان ناوەندێکی ئاکادیمی بۆ پێگەیاندنی کادر و بەرێوەبەر بە شێوەیەکی هاوچەرخ نەبوو. ئەو بەشەی پاشماوەی بەعس بوو هەڵگری هەموو ئەو نەخۆشیانە بوو کە حکوومەتی ناوبراو بەمیرات بەجێیهێشتبوون. سەرباری ئەوش ستافی بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو لە شوێنی خۆی هێڵدرایەوە چونکە جێگرەوەی نەبوو.

پۆستە سەرەکی و سەرکردەییەکانی کارگێڕی بە کادر و لایەنگرانی بزووتنەوەی شۆرشگێری سپێردرا، ئەوانیش جیا لە نیەتی پاك هیچ زانایی و ئەزموونیان نەبوو هەربۆیە ناچار دەبوون پشت بە راو بۆچوونی ئەم و ئەو ببەستن و بەرژەوەندی حزب و خۆیان بپاێزن. ئەوەی نەیدیبێت زەحمەتە تێبگات، کادرێکی شۆرشگێر چاو لە پۆستە سەرەکییەکان بپۆشێت، ئەوەش لە کاتێکدا کەسانی لێهاتوو لەم بوارەدا نەبوون و بەدیل تەنیا کۆنە بەعسییەکان و هاوکارانی پێشووی داگیرکەر بوون. ئەوانەش لە هەموو روویەکەوە خەڵك بە گومانەوە لێیاندەڕوانین و رەتیاندەکردنەوە. نابێ لەبیریشمان بچێ ئەو کادرەی شۆرشگێر بووە، کاتێك دەسەڵاتی دەکەوێتە دەست، هەوڵدەدات هەندێك لە بێبەشی و مەحرومییەتەکانی پێشووی پڕ بکاتەوەو بە گوێرەی دیدی خۆی سەردەمیانە بژێت. ئالێرەدا خەڵك کاردانەوەیان هەبوو بەرامبەر بە شۆرشگێرێك کە تا دوێنێ ئامادەی قبوڵ کردنی مەرگ و خۆفیدایی بووە کەچی ئێستا جل وبەرگ دەگۆرێ و ئەو پۆستانە وەردەگرێت کە داگیرکەرانی بێگانە بەدەستیان بوو. سایکۆلۆجییەتی خەڵك وا راهاتبوو کە پێشمەرگە هەمیشە بە جل و بەرگی کەتافەداری ئارەق بەستوو ببینێ و هەر لە پایگاکانیدا بژێت و وەك سۆفی و زاهید ئەوەی تامی دنیایە، نەیکات.

بێتەجرەبەیی کادری شۆرشگێر لە بەڕێوەبردنی حکوومەت لە ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٥دا و سنوربەزاندنی هەندێك لەوانە، بێزاری و حەساسییەتی خەڵکی زیاتر کرد. قەیرانی ئابووری و قاتوقڕی، ژمارەی هەژارانی ژێر ئاستی هەرەکەمی ژیانی لە کوردستان زۆر کرد. برسێتی و شەڕی ناوخۆ و ئابلوقەی نێودەوڵەتی لەسەر میللەتێك کە هێشتا لە ژێر تاسەی شەڕی سی ساڵە و کردەوەی راگواستن و ئەنفال دەرنەچووە، کاریگەرییەکی قورسی ئەوتۆی هەبوو کە زۆر بە ئاسانی رووی گلەیی لە بزووتنەوەی شۆرشگێریی دەکرد و ساڵانی بەرەنگاری پێشمەرگەی لەبەرچاو نەدەما. من کە ئەو رایە دەنووسم لەبەرچاویشمە کەوا میللەتی کورد وەك هەموو میللەتانی دوای شەرە قورس و شێوێنەرەکان تووشی زۆر نەخۆشی دەروونی و کۆمەڵایەتی بووە و گۆڕانی

زۆر ناواقیعیانە لە ئاگایی گشتی کۆمەڵگادا رووینداوە کە ئەگەر نەخرێتە دۆخێکی نوێ و ئاسایی، ئەوە زۆر بە ئاسانی ئاگایی چەواشە (وەعی موزەییەف) بەسەریدا زاڵ دەبێت. ئاگایی چەواشە زۆر زوو بەناو کۆمەڵی کوردستانی دوای راپەرین بڵاوبۆوە و کارێکی وایکرد کەلێن بکەوێتە نێوان بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی و خەڵك.

لەلایەکی دیکە کادرو پێشمەرگەی تازە دەسەڵاتوەرگرتوو لەبەر کێشەی سیاسی و حزبی ناوخۆی کوردستان، بیری بەلای خۆپێگەیاندن و بەرزکردنەوەی توانایی و زانایی و پسپۆری لە کارگێڕی و شێوازی سیاسەتکردنی نوێ نەڕۆیشت. لەراستیدا سەرکردایەتی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیش ستراتیژییەکی لەم چەشنەی نەگرتەبەر و بیری لە گونجاندنی نەوعیەتی بزووتنەوەکە لەگەڵ قۆناغی نوێ نەکردەوە. ئەوە کارێکە دەبوا زوو کرابا. هەڵبەت ئەگەر ئێستاش بکرێ هەر باشە.

زانکۆکانی کوردستان بەشدارییەکی کاریگەریان لە چارەسەرکردنی ئەم گرفتەدا نەکرد. ئەوانیش دەستپەروەردەی نیزامێکی فاشیستی داگیرکەر بوون و خۆیان لە بازنەی قەیرانی تایبەت بەخۆیاندا دەخولانەوە. هەر بۆیەش پانزە ساڵ دوای ئەم پرۆسەیە نەیانتوانی نەوەیەکی نوێ لە کادری کارگێڕی و تکنیکی بخەنە بەردەست تاکو وردە وردە کەلێنەکان پڕ بکاتەوە.

ئەو کۆچە زۆرەی لە ساڵانی هەشتاوە تاکو کۆتایی نەوەدەکان لە کوردستانەوە بەرەو ئەورووپاو ئەمریکا روویدا، کەسانی خوێندەوار و بەتەجرەبەی لێنەکەوتەوە. کورد لە تاراوگەدا لە پەراوێز دەژیا و نەیتوانی ئەلتەرناتیڤێکی مناسب بۆ کادری ئیداری دروست بکات.

بەم چەشنە دۆخەکە وەك خۆی بەردەوام بوو: تەنیا بەدیلی کارگێڕی و بەڕێوەبردن بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بوو، ئەویش بەبێ ئەوەی هیچ خۆی بە خۆپێگەیاندنەوە ماندوو بکات و هیچ ئەلتەرناتیڤێك بە منافەسە تەنگاوی بکات. شاهیدی ئەوەش هاتن و رۆیشتنی چەند جارەی وەزیر و بەڕێوەبەرەکانە لە یەك پۆستدا. ئەوانە هەمیشە گفتی زل زلیان بە خەڵك دەدا و دوایی لەبیریان دەچوو چیانگوتووە. بۆ



نموونە لە بۆنە تایبەتییەکانی وەزارەتەکاندا، وەزیر یان جێگرەکەی، سکرتێری خۆی تێدەگەیاند وتارێکی بۆ بنووسێت، بەبێ ئەوەی هێڵێکی سیاسی – کارگێڕی بەکردەوەی لەبەر چاوان بێت، دوایی لەبەرامبەر دانیشتوانی هۆڵەکەدا دەیخوێندەوە و زۆر جاریش لە دەزگاکانی راگەیاندندا بڵاودەکرایەوە. دوای ئەوە ناوبراو لەبیری نەدەما لەوێدا چی گوتووەو وەعدی بەچی داوە. سەرەنجام کاردانەوەی خەڵك بەرامبەر بە خوتبەی وەزیرەکان و هەندێك جار هی سەرەوەتریش گوێنەدان و گاڵتەپێکردن بوو. ئالەو حاڵەتانەدا متمانەی نێوان خەڵك و تاکە بەدیلەکەیان کە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕییە، بریندار دەبوو.

ئەگەر باری دەروونی دوای سی ساڵ شەڕی بەردەوام و تێکدان و شێواندنی بەنەخشەی رژێمی داگیرکەر، باری سایکۆلۆجی خەڵکی لەبارچواندبێ و رەگەزی چەواشەی لە ئاگاییاندا زیاد کردبێ، کەمزانایی کادرانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیش لە بەرێوەبردنی وڵات و بەشداری پێنەکردنی خەڵك لە گرفتە سەختەکانیاندا زەمینەیەکی بەپیتی بۆ بەکارکەوتنی ئەو ئاگاییە چەواشەیە رەخساند. لە دیاردە هەرە زەقەکانی ئەم ئاگاییە سەقەتە ئەمانەن: چاوەڕوانی زۆر، وەرگرتنی پارە بەبێ کارکردن، منگەمنگ و گلەیی بەردەوام، ئێرەیی و حەسودی تا ئاستی نەخۆشی، قەت رازی نەبوون، پشت بەستن و ئیتکالیەت بە حکوومەت و حزب، سادەیی لە باوەڕدا، حەوداڵی یەکسانییەکی وەهمی، وازهێنان لە بەرهەم و کشتوکاڵ.

دوای روخانی رژێمی بەعس و داخڵبوونی عێراق بۆ ئەم قۆناغەی ئێستای، بارودۆخ لە کوردستانیش گۆرانێکی چەندایەتی فرەی بەسەرداهات. داهات بە رێژەیەکی زیاتر بۆ کوردستان گەڕایەوە و حکوومەتی کوردستان شەرعیەتی دەستوری وەرگرت و بوارێکی زۆری بۆ رەخسا تا راستەخۆ پەیوەندی بە جیهانی پێشکەوتووەوە بکات. وڵات لە حاڵەتی دوو ئیدارەیی دەرچوو، بوژانەوەیەکی ئاوەدانکردنەوەی زۆر هاتەکایەوەو ئاستی ژیانی خەڵك بەرزتر چوو. کوردستان راستەوخۆ دەرگاکانی بەسەر جیهاندا کراوەتەوە و دەرفەتی دیتنی تەجرەبەی وڵاتانی دیکە بۆ هاووڵاتیان رەخسا.





ئەوە لە کاتێکدایە کە رەگەزی چاوەڕوانی زۆر و ئیتکالییەت لە ئاگایی هاوولاتیاندا وەك خۆی ماوەتەوە.

هەندێك گرفتی سەرەکی ژیانی رۆژانەی خەڵك لەم قۆناغەشدا چارەسەر نەکران، ئەوانەش کارەبا و ئاو و سوتەمەنییە. ئەوە وایکردووە دەنگی نارەزایی خەڵك بەرزتر ببێتەوەو بەشێوەی جیاجیا ئەو دەربڕینانە ببیستین و ببینین. لێرەدا لێکحاڵێنەبوون لە نێوان حکوومەت و خەڵکدا هەیە: ئەو خواستە سەرەکییانەی سەرەوە جیا لە پسپۆرانی ناوخۆ( کە نیمانە) پێویستی بە سەرمایەیەکی زۆر و زەمانێکی درێژ هەیە تا بە شێوەی بنەڕەتی چارەسەر دەکرێن، ئەوجا پێویستە ولاتانی دەوروبەریش بە سیاسەتی جیاجیا تیرۆری ئابوریمان نەخەنەسەر. هەموو ئەو گرفتانەمان هەیە بەلام حکوومەت بەبێ دەنگی خۆی، راستییەکانی بەخەڵك نەگوتووە تا تێبگەن و هاوکاری بکەن. دەبوا حکوومەت راستییەکان بەوهیوایە بەڵکو چارەسەریان بکات، نەشارێتەوە. ئەم شاردنەوەیە ئاگایی خەڵك و هەڵسەنگاندنەکانی چەواشەتر کرد. کار گەیشتە رادەیەك لەناو خەڵکی ئەنفال بەزێندا دیاردەی نامۆی ئەوتۆ سەرهەڵبدەن کە سەرکەوتنە یاسایی و سیاسییەکانی سەرکردایەتی خۆی لەبەر چاو تەنك بێتەوە و پرسی سەربەخۆیی لە بەرامبەر هەبوون و نەبوونی سوتەمەنی دابنێ و وردە وردە مەزاجی خۆی رووەو گیرەشێوێنی بەرێت.

من پێموایە ئێستا وەختیەتی حکوومەت شێوازی کاری خۆی بگۆرێ و هاوولاتیان بخاتە بەردەم گرفتە ئابوورییەکان، هەروەك چۆن لە کاتی قەیرانە سیاسیەکاندا ئەو کارە دەکات. هەروەها پێداچونەوەیەکی جدی بە ستافی بەرێوەبەرایەتی حکوومەتدا بکات و تادەتوانی کەسانی زاناتر بخاتە سەر پۆستەکان و میکانیزمێکی هاوچەرخ بۆ کاری ئیداری دابنێ کە لەوێدا لێپێچانەوە لە گەندەڵی کارێکی سەخت نەبێت.

گەندەڵی بووەتە کێشەیەکی نوێ، هاوولاتیان بەرامبەری حەساسن و دەیانەوێ دڵنیابن کە حکوومەت ئەم دیاردە دزێوە قبوڵ ناکات و ئالیەتی چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە. هەڵبەت گەندەڵی دیاردەیەکی کۆنەو بەسەر تەونی کارگێڕیی ولاتانی



پەرەئەستین (الدول النامیە) دەژیت و پێویستە بەردەوام قەلاچۆ بکرێت. ئەم کێشەیەش لە ئاگایی خەڵکدا زۆر شێویندراوە و گەورەکراوە بەچەشنێك تا ئاستی یەکەمی قەیرانی ئێستایان هێناوە. من لەم نووسینەمدا بە شێوەیەکی تایبەتی دێمەسەر گرفتی گەندەڵی و باسی تایبەتمەندییەکانی ئەم دیاردە نەخۆشەی کوردستان دەکەم.

### ٤- ئازادی و ئاژاوەگێڕی پێکەوەڵناکەن:

لەکاتی باسکردنی مافەکانی هاوولاتیان و بە یاسا رێکخستنیان، ئاماژەیەکی خێرام کردە سەر دادپەروەری. رەگوریشەی عەدالەتخوازی جیا لە واقیعی پاشکەوتوویی کۆمەلایەتی و فراوانبوونی هەژاری، پێشینەیەکی مێژوویشی لە کەلتوری مرۆڤایەتیدا هەیە. پرۆسەی پێگەیشتنی مرۆڤ لە کارو کۆششی بەردەوامی ناسین و بەرهەمهێناندا بووە تا بتوانێ بەردەوامی وەچەی مرۆڤایەتی دابین بکات و پێویستییەکانی ژیانێکی ئاسودەی بۆ دەستەبەر بکات. هەر لەو پێناوەشدا بۆ پڕکردنەوەی فەرق و جیاوازی نێوان تواناکانی تاك و کەمکردنەوەی زوڵم و چەوساندنەوە، بەڵی بۆ هەموو ئەوانە هەمیشە دەست بە بنەمایەکی ئینسانی سابیتەوە گیراوە ئەویش دادپەروەری (عەدالەت) بووە. هەربۆیەش ئەم چەمکە لەسەرەتاکانی مێژووی مرۆڤایەتییەوە بە شێوەی جیاجیا و بە ئاستی لێکتر جودا لە کەلەپوری فەرهەنگی مرۆڤدا جێیکراوەتەوە. ئەوەش هەر لە ئەفسانەکانەوە بگرە تا دەگاتە ئاین و سەرەنجام ئایدیۆلۆژیاکان، پانتاییەکی زۆری داگیر کردوە.

وەك باسمانکرد، دابین کردنی مافەکانی مرۆڤ و هاوکاریکردنی بۆ پێگەیاندن و خۆپێگەیاندن هەروەها دروستکردنی دەرفەتی لەباری کۆمەلایەتی بۆ ئەوەی خۆی تێدا بدۆزیتەوەو رۆڵی شیاوی خۆی بگێرێ و بەشدارییەکی ئاسایی لە ژیانی کۆمەلایەتیدا بکات، ئەوانە بنەما سەرەکییەکانی دادپەروەری ئەم سەردەمە پێکدینن.





هەڵبەت لایەنێکی دیکەی ئەم چەمکە بە هاناوەچوونی لێقەوماوان و پەککەوتانە، بۆ ئەوەی مافی ژیانیان بۆ بگێردرێتەوە کە لە ئەنجامی هەر نەهامەتییەکی سروشتی یان سیاسی یان کۆمەڵایەتی توشیان بووبێ و دەستەوەستانی کردبن. ئەمە لەم زەمانەدا ئەرکێکی حکوومەتە کەوا بەشێکی زۆری بودجەی خۆی بۆ تەرخان بکات. لەلایەکی دیکەش هاوکاری رێکخراوە مەدەنییەکان بکات تاکو لەوپێناوەدا پرۆگرامی هاریکاری خۆیان ریکبخەن. لە دنیای ئێستادا ژمارەی ئەو رێکخراوە نێودەوڵەتی و میللییانەی لەم پێناوەدا چالاکن ژماردنیان کارێکی قورسە.

حکوومەتی کوردستان لەم پێناوەدا چی کردووە؟

دێنێ لەسەر ئەم پرسیارە بوەستین. ئەگەر ئاستی نزمی توانایی زانستی و پسپۆری کادری خزمەتگوزاری حکوومەت و چاوەڕوانی زیادەو پشوی هاوکاری نەکردنی ناو کەلتوری کوردەواریمان لەبەر چاو نبیت، بۆمان دەردەکەوێت هەر دابینکردنی خزمەتی تەندروستی بەخۆڕایی، پەرەپێدانی خزمەتگوزاری شارەوانییەکان و پەروەردەی بەخۆڕایی، لەگەڵ ئەو هەموو معاشە لەپێناو و بێ پێناوانەی دەدرێتە هاووڵاتیان، ئەوانە هەموویان لە دنیای ئێستادا بەکاری بەهاناوەچوون و کردەوەی هاوکاری کۆمەڵایەتی حساب دەکرێن کە حکوومەت لە کوردستان پێیانهەڵدەستێت. لە وڵاتانی دیکەی پێشکەوتوودا ئەم بوارانە بە شێوەیەك رێکخراون کەوا لە باج و دەرامەتی هاووڵاتیان دەگێردرێتەوە.

دەکرێ بڵێین لەم قۆناغەدا کە کۆمەڵگای کوردستان بەرەو خۆرێکخستنەوەو بوژانەوەیە و دەیەوێت ئاسەوارەکانی داگیرکران و جەنگ بسرێتەوە، حکوومەت لەسەریەتی بەشی هەرە زۆر سامانی سروشتی وڵات بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکات. ئەگەر ئەم راستیە بڵێین، پێویستە قبوڵیش بکەین کەوا باری حکوومەت و دەزگاکانی زۆر قورس دەبێ و پرۆسەی بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و گیانی بەشداریکردنی چالاکانە لای هاووڵاتیان دادەبەزێت. هاووڵاتی راهاتووە تەنیا



وەربگرێت و پاڵبداتەوە. ئەم نەرێتەش سیفەتی چاوەڕوانی بەردەوام و پڕنەبوونەوەی قەناعەت دروست دەکات و تاك ئامادە دەکات هەمیشە نارازی و شەرانگێز بێت.

حکوومەتی کوردستان لەم سیاسەتەیدا داخلی قۆناغی نێگەتیف بووە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم پێویستە ئەو سەرمایەی بۆ خزمەتگوزارییەکان تەرخان دەکرێ نەك هەر زیاد بکرێ بەڵکو هەمیشە ئاشکراش بکرێ. ئەوجا ئەو سەرمایەی بۆ معاش و هاوکارییەکان دەدرێ، لە خزمەتگوزارییەکان جیابکرێتەوەو لە وەزارەتێکی تایبەتدا تەنزیم بکرێ. وەختی ئەوە هاتووە حکوومەت بۆ هاووڵاتیان ئاشکرای بکات کە: ١- بۆ کارە ئیداری و خزمەتگوزارییەکان چەند کادری پێویستە و چەندیش سەرمایەی تیدەچێ. ٢- بۆ هاوکاری و بەهاناوەچوونی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستان چەند سەرمایە تەرخان دەکات؟ ٣- ژمارەی ئەو خەڵکانەی بەبێ پاساوی کۆمەڵایەتی، وەك کارمەندی زیادە، معاش وەردەگرن چەندن؟ ئینجا بخرێنە سەر یەك وەزارەت و پێیانبگوترێ کە بە شێوەیەکی کاتی و تا کار پەیدا دەکەن ئەم هاوکارییە وەردەگرن.

٤- دیاردەی چەند معاشێتی، چەند لەو رێژەیەی سەرەوە داگیر دەکات، ئاشکرا بکرێت، ئەوجا بە دەنگی بەرز لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی بریاری لەسەر بدرێت.

ئەوەی تا ئێستا حکوومەتی کوردستان دەیکات، هەمووی دەکەوێتە خانەی پەیرەوکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. ئەم سیاسەتە لە جەوهەردا زۆر ئینسانییە و لە ئاکامدا زەمینەی لەبار بۆ هەڵسانەوەی تاك دەرەخسێنی تا بتوانێ بە تواناییەکانی خۆیدا بچێتەوە و بە پێی شارەزایی و حەزی خۆی رۆڵی کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی هەڵبژێرێت.

ئاستی نزمی فەرهەنگ و زانیاری خەڵك، هەروەها پاشماوەی شێواندنەکانی سیاسەتی حکوومەتی داگیرکەری عێراق لەسەر کۆمەڵگای کوردستان، کارێکی وایکردووە بەد کەڵك لەم سیاسەتە وەربگیریت و سەرەنجام کەسانی هەلپەرست برەو بە قۆستنەوەی تواناییە مالی و ئیدارییەکان بدەن و گەندەڵی گەرا بنێتەوە.

ئازادییەکانی تاك و کۆمەڵ تەنیا بە بڕیاری سیاسی و دانانی یاسای بریقەدار دەستەبەر ناکرێن. ئەوە ئەرکی حکوومەتە دوای بوژانەوەی ژیانی ماددی و مەعنەوی تاك، ئەو توانایەی پێبدات بیر لە ئازادییەکانی دیکەی بکاتەوە. ئەوانیش بریتین لە ئازادی بیروبروا، کار، شوێن، بەشداری سیاسی و نەهێشتنی فەرق و جیاوازی نەتەوەیی و دینی و رەگەزایەتی لەم بوارانەدا.

راهاتنی تاك و کۆمەڵەکان لەسەر پەیڕەوکردنی مافەکانیان کارێکی ئاسان نییە. دیموکراسی تەنیا مافی رووت نییە بەڵکو کەلتوریشە. واتە بۆ چۆنیەتی کەڵك وەرگرتن لە مافە دیموکراتییەکان پەروەردەو راهێنان پێویستە. مەبەستیش لەم پێناوە زیان نەگەیاندنە بە دامودەزگاکانی وڵات و بەرژەوەندی و ئازادی کەسان و کۆمەڵەکانی دیکە. تا مرۆڤ رادێت ئازادییەکەی هێندە مانای هەیە کە نەبووبێتە مایەی زیان و ئازار گەیاندن بە خەڵکی دیکە، زەمانێك پێویستە. هەر ئەوەشە ئەگەر بەردەوام خەڵك هوشیار نەکرێتەوە، ئاژاوە زاڵ دەبێ و تاکەکان بزانن یان نەزانن یەکدی پڕیندار دەکەن.

شەرمی تێدانییە، کورد لە پەیڕەوکردنی دیموکراسیدا کەلتورێکی دەوڵەمەندی نییە. ئەوە پانزدە ساڵ بەسەر رزگاریدا تێپەری کەچی تا ئێستا مومارەسەکردنی سیاسی لە نیزامی دیموکراسی کوردستاندا جێگیر و تۆکمە نەبووە. بۆیە دەبێ بە پشوویەکی درێژەوە کار لەسەر دیموکراسی کۆمەڵایەتی و فەردی بکرێت تا تاکەکان رابێن چۆن تەعبیر لە خواستەکانیان بکەن و لە پاڵ فێربوونی مافە دیموکراتییەکانیان، رۆشنبرییەکی یاسایی دیموکراتییانەش پەیدا بکەن.

لەم سەردەمەدا دیموکراسی هاوکاتە لەگەڵ لێشاوی تکنۆلۆژیای زانیاری و گەیاندن و راگەیاندن. ئەگەر هاووڵاتی ئەو رۆشنبیرییە یاساییەی تایبەت بە دیموکراسی وەرنەگریت، دوورنییە وێنەیەك یان وتارێك ببێتە هۆی سەندنەوەی ماڵ و گیانی کەسانی بێتاوان.



لەلایەکی دیکە لە کەلتوری رۆژهەڵاتدا رەگەزێك بەناوی یاسا و دیموکراسی نییە. ئەوە کوردستانیش دەگرێتەوە. لەم ناوچەیەدا دین و شەریعەت پێکهێنەری بنەمای ماف و جۆری رەفتارەکانن، هەربۆیە کارێکی ئاسان نییە هاووڵاتی لە ناخەوە مل بۆ یاسا کەچ بکات و ژیانی خۆی لەسەر تەنزیم بکات. ئەمەشیان زەمینەیەکی لەبار دروست دەکات بۆ بێ ئیلتیزامی کردن و پێشیل کردنی بەرژەوەندی گشتی. هەروەك دەزانن لە جیاتی یاسا شەریعەت فەرمانڕەوای ناخودئاگای (اللاشعور) مرۆڤەکانە، بە شەریعەت دەستدرێژی بۆ سەر ملکی حکوومەت حەرام نییە و ئیلتزام نەکردن بە یاسا گوناح نییە. ئەم پێکهاتە کەلتورییە هانی ئاژاوەگێری (فەوزەوییەت) دەدات.

لە ئەورووپای دوای سەدەکانی ناوەراستیش گرفتی لەم چەشنە هەبوون کە سەرەنجام بە چاکسازییەکانی ئاینی و کۆمەڵایەتی چارەسەرکرا. سەرباری ئەوەش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە، ئەوکاتەی گۆرانکارییە دیموکراتییەکان لە قوڵبوونەوەدابوون، دیسان دیاردەی ئاژاوەیی بە فراوانی سەریهەڵدایەوە و تا کۆتایی سەدەی ناوبراو بەردەوام بوو. لەوکاتدا سەد ساڵی پێویست بوو تاکو رەفتار و نەرێتی دیموکراتیانە شوێنی ئاژاوەیی گرتەوە. مەبەستم لەو قسەیە سەد ساڵی تریش بۆ کوردستان نییە، بەڵکو هەوڵدەدەم بڵێم لە وڵاتی ئێمەشدا دیاردەی ئاژاوە هەیە و پێویستە بە یاسا و رۆشنگەری بەرامبەری بوەستین. با نموونەیەك لە گەنجێك بێنمەوە کە ئاوها هەستی خۆی دەربڕیوە:"هەر کە هاووڵاتیەك لەداخان پەلاماری شوێنێك دەدات بە گێرەشێوێنی لەقەڵەم دەدەن، ئەی بۆچی ئەو بەرپرسە بە تاوانبار لە قەڵەم نادەن کە دەبێتە هۆی پشێوی نانەوەو گێرەشێوێنی دروستکردن و تێکدانی شیرازەی ژیان و رق هەستانی هاووڵاتی".

ئەم گەنجە لێپرسراوانی حکوومەت کە رێگایان لە پەلاماردانەکان گرتووە بەوە تاوانبار دەکات کە رقی خەڵکی هەڵساندووە، بەم پێیە هەرچی رقی هەڵسا بۆی هەیە پەلاماری شوێنێك بدات. ئەنارشیزم (ئاژاوەیی- فەوزەوییەت) ئاوها بیردەکاتەوە و باسی هەموو شتێك دەکات تەنیا یاسا نەبێت.





یەکێك لە شانازییەکانی کوردستان، ئاوەدانکردنەوەی شارو گوندە تێکدراوەکانییەتی، نابێ ڕێگا بدرێ بە ناوی خۆپێشاندان سەرلەبەر وێران بکرێنەوەو بسوتێندرێن. لەو پێناوەدا تەنیا پۆلیس بەکارنایەت بەڵکو پێویستە بە ڕۆشەنگەری و گفتوگۆیەکی فراوان و ماندوونەناسانە ئەو ڕوانگا هەڵەیە بگۆڕین و هاووڵاتیان رابێن نارەزاییەکەیان بەقسە و نووسین و ڕێپێوانی هێمنانە دەربڕن. لە هەمانکاتدا گیروگرفتە سەرەکییەکانیان لەگەڵ باس و چارەسەر بکرێت. هەڵبەت ئەم قسانەم پاساوی ئەو چەند ڕووداوە توندە نییە کە ئاسایش لەبەرامبەر خۆپیشاندەران لە چەند شارێکدا کردی.

## ٥- پرۆسەی دەوڵەمەندی و دیاردەی گەندەڵی:

هەر میللەتێك سەربەخۆیی نەدیتبێت، دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتیی ناناسێ و بە ئاسانیش تێیانناگات. بەڵام ئەگەر هەمان دیاردە لە ژیانی میللەتانی دیکەدا ببینێ بە ئاسانی وەریدەگرێت و بەسەریدا تێدەپەڕێ، لێ بە قووڵی هەستیان پێناکات چونکە لەگەڵیان ناژیت. لەناو میللەتانی ژێردەستە و ستەملێکراودا کەس خاوەنی ئیرادەی خۆی نییە و ناتوانی هیچ نەخشەیەکی بۆ دەرەوەی زاتی خۆی هەبێت چونکە دەسەڵاتێك نییە پشتیوانی لێبکات و بۆی بپارێزێت.

لە قۆناغی دوای سەربەخۆییدا هێدی هێدی دیاردەی نۆی دێنەکایەوە کە تەعبیر لە گۆڕانکاری قوڵی ناو کۆمەڵگا دەکەن. هەموو دیاردەکان کێشەو بەرەنگارییان لەگەڵدایە و بە ئاسانی قبوڵ ناکرێن و جێگیر نابن. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کامڵترو فراوانتر دەبن و کەسایەتییەکان جێگۆڕکێ بە دەورەکانیان دەکرێت. ئەگەر لە ناو میللەتێکی ژێردەستەدا بەرەنگاربوونەوەی پۆلیس و سوپای داگیرکەر بە لەخۆبوردەیی و شەهامەت دابندرێ، هەمان کەس لەدوای سەربەخۆیی بە ئاسانی ناتوانێ گوێڕایەڵی پۆلیس و ئاسایشی خۆیی بێت. یان ئەگەر یەکێکی پێشمەرگە بە خەبات و فیداکاری خۆی بووبێتە جێگای ڕێزلێنانی هاووڵاتییەکانی، هەر هەمان



پێشمەرگە لەوانەیە لەدوای سەربەخۆیی روو لە ژیانێکی مەدەنی بکات و وردە وردە دەوڵەمەندیش بێت. لەم دەورەی تازەیدا هەندێك هەڵوێستی دەبێت کە بە ئاسانی لای ناسیاوانی پێشووی قبوڵ ناکرێت چونکە وا ڕاهاتوون کە پێشمەرگە تا هەتایێ دەبێ چەکی لە شاندابێت و ماڵی دنیاشی بەلاوە گرنگ نەبێت. دوور نییە هەمان هاووڵاتی دەوڵەمەندبوونی هاوکارێکی ڕژێمی پێشووی بەلاوە ئاسایی بێت. نموونەیەك دێنمەوە. گەنجێکی توندرۆ ئاوها وەسفی هەندێك پێشمەرگەی دوێنی دەکات: "من هەموو ئەو بەرپرسانەم بە جلی شڕ و پێڵاوی لاستیکەوە بینی، هەر هەمان بەرپرسم بەوپەری سەرمایەوە بینی. من بەرپرسم بینی پارەی قاتی جلەکەی بەری بەشی ژیانی مانگێکی بیست گەنجی ئەم وڵاتە بوو. هەندێك لەمانە بۆ ئەوە خەباتیان کردووە ئەمڕۆ ببنە سەرمایەدار و ئێمەش وەك ڕەعیەت تەماشا بکەن و هەر کاتێکیش قسەمان کرد منەتمان بەسەردا بکەن کە خەباتیان کردووە".

ئەم گەنجە دوای سەربەخۆیی وڵات، دەبێ گیروگرفتی زۆر بووبێت و بە ئاسانی چارەسەرییەکانی نەدۆزیبێتەوە، بۆیە ناخوداگا تەعبیر لە قەناعەتە دەروونییەکانی دەکات کە من پێموایە لەناو کۆمەڵدا ئەم قسانە گوێی لێدەگیرێ و بڕوایان پێیەتی. بەڵام ئەم بڕوایە ئاسۆیەکی فراوانی نییە و جیا لە عەدالەتی سادەو ساکار بیر لە هیچی دیکە ناکاتەوە. واتە دەیەوێ نان و سەرپەنایەك بە یەکسانی بۆ هەمووان هەبێت و هیچی دیکەی ناوێ. لە بەشی هەبوونی نان و خانو و کار بۆ هەموو هاووڵاتیان منیش لەگەڵێدام، بەڵام قبوڵ نەکردنی گۆڕانکارییەکانی ناو کۆمەڵ و وەستان لە ڕوویاندا بە ڕاست نازانم. هەر لەو ڕوانگایەشەوە تیکۆشەرانی ڕۆژانی سەخت وەك هەر هاووڵاتییەك مافی خۆیانە بە شێوازی ئاسایی و ڕەوایانە کارو پیشەی نوێ بدۆزنەوە.

بەپێچەوانەی ئەو گەنجە توندڕۆیەوە، پیشمەرگەیەکی کۆن دەڵێت: "بۆچی جاش یان بێلایەنێکی زەمانی شۆڕش مافی کارکردن و دەوڵەمەند بوونی هەبێت، بەڵام منی خۆفیداکار دەرفەتی کارم لێبسەننەوە چونکە پێشمەرگە بووم!".





ئەوانە دوو ڕوانگای کۆمەڵگای دوای سەربەخۆیین. ئەگەر ئەم ڕوانگایانە پێکەوە گفتوگۆ بکەن ئەوە کارێکی سەردەمیانەیە بە مەرجێك نەگاتە ئاقاری ڕەدکردنەوەی گۆرانکارییەکان.

ئێستا بەشێکی زۆری سامانی کوردستان سەرفی ژیانی ناوخۆیی دەکرێت بۆیە زۆر ئاساییە ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیان، بە شۆرشگێر و ناشۆرشگێرەوە ببنە بازرگان و دەوڵەمەند بن چونکە ئێستا قۆناغی گردبوونەوەی سەرمایەیە(التراکم الراسمالی). ئەوەش قۆناغێکە هەموو میللەتانی ئازاد لە سەرەتای گەشەسەندنی سەرمایەداریدا پێیدا تێدەپەڕن. قۆناغی گردبوونەوەی سەرمایە مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە و هەمیشە جۆرێك لە زبری و منافەسەی توندی تێدا بووە. تا سەرمایەدار دروست نەبن، سەرمایەی وڵات بەگەڕ ناکەوێت و منافەسەی بەرهەمهێنان دروست نابێت. هەر بۆیەش بەبێ سەرمایەدارانی خۆیی دان و ستاندن لەگەڵ جیهانی دەرەوەمان پوخت نابێت. هەڵبەت ئەم قسەیەم بەو مانایە نییە کە پرۆسەی دەوڵەمەند بوون لەسەر حسابی هەژاربوونی هاووڵاتیانی دیکە ڕووبدات. ئەم زەمانە سەردەمی ڕەفا و کامەرانییە و سیستەمی دیموکراسی دادپەروەر دەبێ ببێتە زامنی پاراستنی ژیان و ئاستی دیاریکراوی داهاتی هاووڵاتیان. بۆ ئەوەش زانست و تەجرەبەی جیهانی پێشکەوتوومان لەبەردەستە تا ژان و ئازارەکانی گەلانی دیکە دووبارە نەکەینەوە.

گرفتێکی گشتگیر بۆ تێکرای وڵاتانی پەرەئەستێن (الدول النامیە) ڕوودەدات، ئەویش لە پرۆسەی گۆانکارییەکانی کۆمەڵایەتی و گردبوونەوەی سەرمایەدا، داب و نەریتی کۆمەڵگای تەقلیدی و کەلتوری داخراوی سەردەمی پێش گەشەسەندن، تا زەمانێکی زۆری دوای بەسەرچوونی سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆی، دەمێنێتەوە و تاکەکان پێیدەژین. لەوەدا لەسەریەکدی حساب بوون و لایەنگیری عەشیرەتی و خێزانی و مەزهەبی، هەروەها تێکەولێکەی ناڕەوایانە وا دەکات پۆستی ئیداری و پایگای کۆمەڵایەتی بقۆزرێنەوەو بە شێوەیەکی ناڕەوایانە کەسانێك لەسەر حسابی سامانی کۆمەڵگا دەوڵەمەند بن. ئەم دیاردەیە کە پێیدەگوترێ گەندەڵی، زیان دەگەیەنێتە





پرۆسەی گەشەسەندنی سەرمایە و بوژانەوەی ئابوری. لە هەمانکاتدا بێزاری و ناڕەزامەندی گشتی دروست دەکات. بۆ ئەم کردەوەیەش کەسانی ناڕازی دەگەڕێنەوە سەر ڕوانگاو بیروباوەڕی پێشوویان تا پاساوێك بۆ ناعەدالەتییەکە بدۆزنەوە.

هەڵبەت لە هەر قۆناغێکدا میکانیزمی تایبەتی و هاوچەرخ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان هەیە. ئەویش تەنیا لەرێگای دەسەڵاتی شەرعیەوە دەکرێ کە پەرلەمان و حکوومەتی کوردستانە. بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی ناپەسەندی نوێ بە بیروباوەڕی تەقلیدی کۆن ناکرێ، بۆیە بەخێرایی لە جیاتی چارەسەرکردن، توندڕەوی و ڕەفزکردنەوەی لێدەکەوێتەوە.

گەندەڵی دیاردەیەکی مشەخۆری نەخۆشی کۆمەڵایەتییە کە لەگەڵ پێشکەوتنی ئابوری و ئیداری پەیدا دەبێت و لەسەر تەونی ئەوان دەژێت. ئەم دیاردە ناپەسندە زیانبارە بە میکانیزمی تایبەت لەلایەن حکوومەتەوە قەلاچۆ دەکرێ و بە پێشکەوتنی کەلتور و بەرزبوونەوەی ئاستی رۆشنبیریی تاك و بوژانەوەی ئابوری، وردە وردە پاشەکشە دەکات.

ئەم دیاردەیە لە کوردستانیشدا هەیە و زۆر سەیر نییە، چونکە ئێمەش سەربەخۆییمان هەیە و بەرەو پەرەسەندن و گەشەسەندن دەڕۆین. لە جیاتی سەرسورمان و هات و هاواری ئەنارشیستانە، پێویستە هاوکاری حکوومەت بکەین تا دوای لێکۆلینەوەی ورد، بکەوێتە چارەسەرکردنی. لەلایەکی دیکە کردەوەیەکی ڕۆشنگەری بەرفراوانی نیشتمانی دەستپێبکرێ تا هەموو هاووڵاتیان بەشداری تێدا بکەن. ئاژاوەگێریی ئەو ئامانجە ناپێکی بەڵکو ڕق و حەسودی بڵاو دەکاتەوە کە بەلای خۆیەوە لە نیهایەتدا جیا لە توندوتیژی، کەلتوری گەندەڵی دەهێڵێتەوەو دەبێتە شەریکی. بەداخەوە ئەوەی ئێستا دەبیسترێ ئێرەیی بردنە بەو دەرفەتەی بۆ گەندەڵەکان هەڵکەوتووە، نەك چارەسەری. ئەمە کارێکی ترسناکە. نموونەیەکی دیکە دێنمەوە.گەنجی یەکەمی توندرۆ کە لەم نووسینەدا باسمکرد، لە بەشێکی نووسینەکەی دەڵێ: "ئاخر پێمخۆش نییە پەنا بۆ شێوازی لێپێچانەوەکانی سەددام ببەم (کە ئەو

باشتر خەڵکەکەی دەناسی) نەیدەهێشت گومان بگاتە رادەی یەقین و کۆتایی بەو کەسە دەهێنا"!. کاکم دوایی دەگێڕێتەوە کە سەددام چۆن ئەندازیاری پرۆژەیەکی تێشکاوی ئیعدام کردو دوایی کارمەندەکانی پرۆژەکەی کۆکردەوەو پرسی دەزانن فلانی لە کوێیە؟ کارمەندەکان گووتیان نەخێر. سەددام ئیشارەتی بۆ کاشیەکانی ژێر پێی خۆی کردو گووتی: ئا لەبن ئێرەدایە!!

گەنجی خوێنگەرم داوا دەکات هەموو ئەوانەی لێپرسراوی حکوومەتن و یان ئێستا دەوڵەمەندن و رۆژگارێك پێشمەرگە بوون ئاوها ئیعدام بکرین!! کەچی نایەوێ بیری بێتەوە کە سەددام نیزامەکەی لە هەرەگەندەڵەکانی رژێمەکانی دیکتاتۆری ئەم زەمانە بوو. دیارە چارەسەر بەو بەرچاوتەنگی و تەقلیدییە لە بیروباوەردا ناکرێت.

## ٦- سایکۆلۆجیای گشتی و سەرکردایەتی سیاسی:

ئەگەر جارێکی دیکە بگەرێینەوە سەر ئاستەنگەکانی بەردەم دروستبوونی دامودەزگای هاوچەرخ، بۆمان دەردەکەوێ، ئەو کارە تەنیا بەخواست و ئیرادەی پاك ناکرێ بەڵکو پێویستی بە چەند پێشزەمینەو هۆکار هەیە کە هەموویان تیایدا کاریگەرن. جا ئەوە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی مێژووکردەو گەرانەوەی تێدا ناکرێ و پازدان و چاونوقاندنیش بەسەر واقیعەکەدا هەڵناگرێ.

دەزگا (المؤسسە) لە حکوومەت و کۆمەڵگادا هەمیشە دوای قۆناغی سەربەخۆیی دەستپێدەکات. پێویستە ئیرادەیەکی سیاسی خاوەن پرۆژەی سەربەخۆ و میللی، پشتیوانی بکات. دوای ئەوە بەرچاوڕوونی سەرکردایەتی ولات لەو پرۆسەیەدا دەورێکی کاریگەر دەگێرێ. با ژاپۆن و میسر بە نموونە بێنینەوە: ئیمپراتۆر و سەرکردایەتی سیاسی دەوڵەتی ژاپۆن بە نەخشەو بریاری جدی ئەو ولاتەیان بەرەو پیشەسازی و دیموکراسی و حکوومەتی دەزگایی برد. کەچی لە میسر سەرکردە یەك لەدوای یەکەکان بە سیاسەت و بیرورای تەقلیدییەوە خەریکبوون و روانگایەکی روونیان لەسەر داهاتووی ولات نەبوو، بۆیە ئێستا میسر بە ولاتێکی پاشکەوتووی پەرەئەستێن دادەندرێ.



لەم رووەوە بەرچاورونیەکی شایانی باس لەلای سەرکردایەتی کوردستان هەیە، بەڵام وەنەبێ کەموکوڕی نەمابێ. بۆ نموونە منافەسەی سیاسی و بەرژەوەندی بەرتەسك، پرۆژەی حکوومەتی دەزگاییشی گەچلاندووە. کەسانێکی دەستڕۆیشتوو بەرژەوەندییان لەو منافەسەیەدا درێژخایەنە، بۆیە دەبێ بەلامانەوە ئاسایی بێت کەوا پرۆژەی دەزگایی بە ئاسانی پیادە نەکرێت.

لەلایەکی دیکە فەرهەنگی کۆمەڵگا بۆ خۆی سەرچاوەی ئاستەنگ و کەلەبەرەکانە. ئەم فەرهەنگە هی زەمانی ژێردەستەییە و هەڵگری هەموو شێواندنەکانی ئەو زەمانە. گەندەخۆری و دەستناپاکی و مەحسوبیەت و ئاوسانی ئیداری لەو کاتەوە دروست بووە، ئەگینا بەشێك نەبووە لە نەریتی شۆڕشگێران. ئەم کۆمەڵگایە لە هەشتا ساڵ ژێردەستەیی عێراق و سەرکوترانەوەو ستەمدیدەییدا تووشی چەندان نەخۆشی و نەریتی لادەرانە بووە کە حکوومەتی کوردستان بە دەستییەوە گرفتارە، ئەم حاڵەتە نەخۆشییە بە ئاسانی و لە ماوەیەکی کورتیشدا چارەسەر ناکرێت، بەڵکو پێویستی بە کارتێداکردنی دیراسەکراو هەیە تاکو ئەم نەخۆشییانە بنەبڕ دەکرێن. ئێستا هەر ئەم نەخۆشیانەن کە پەرەدەستێنن و دەبنە دیاردەی قەڵپ و بەسەر سەرکردایەتی کوردستاندا دەشکێنەوە.

ئەم حاڵەتە جۆریك لە سایکۆلۆجیای گشتی دروست دەکات کە نیگەرانییەکی گشتی و بڕوا نەبوون و باڵۆرە و پڕوپاگەندە بە ئاسانی بلاودەبنەوە و هاوولاتیان پێیانەوە سەرقاڵ دەبن. ئەم چەشنە ساکۆلۆجییە، شەپرێوی دەخاتە ناو رای گشتی، ئەو رایە گشتییەی لەوەوپێش بوێرانە لەسەر مەسەلە چارەنووسییەکان بریاری یەکلاکەرەوەی داوە. لەوانەیە لە هەندێك ناوەندی سیاسی رکابەر و ناحەز بە کوردستانیش، بە ئامانجی دیاریکراو، لەسەر ئەو پانتاییە گشتییە کار بکرێ و بیانەوێ بەردەوام گومان و شەرانگێزی دەرخواردی هاوولاتیان بدەن و قین و مۆرە بەرامبەر بە رابردووی پێشمەرگە دروست بکەن. هەر دوێنێ و پێری بوو هەندێك لایەنی ئیسلامی بە ئاشکرا دەیانگووت شانازی دەکەین کە رۆژێك تەقەمان بە تفەنگ نەکردووە و ژن و منداڵمان هەتیو و





بێوەژن نەکردوون! هەر ئەوانە دەڵێن پێشمەرگایەتی بە شانازی ناژمێردرێ. یان پشویان بەوە خۆش دەکرد کە بزووتنەوەی شۆرشگێڕیی کوردستانیش وەك بزووتنەوەی فەتحی فەلەستین متمانە دەدۆڕێنێ و هاوشێوەکانی حەماس دێنەسەر کورسی دەسەڵات، ئەوجا راحەت کوردستان وەك کابۆل و غەززە لێدەکەن!.

گرفتە وزەییەکان وەك سوتەمەنی و کارەبا، بەتایبەتی بۆ برەودان بەو ئامانجە زیانمەندانەی سەرەوە قۆزتراونەتەوە و سایکۆلۆجییەتی نیگەرانی، بە ئاسانی گوێی بۆ رادەگرێت، هەر چەند تەئیدیان ناکات بەڵام لە بەرپەرچدانەوەیاندا زۆر چالاکی لەخۆ نیشان نادات. با نموونەیەکی دیکە بێنمەوە ئەویش نووسینی یەکێك لەو هاوولاتییە بێتەجرەبەیە کە سەددام بە نموونەی سەرکردەی سەرکەوتوو دەزانێ، دەڵێ: (سەرۆکی کوردستان خەون بە دەوڵەتی سەربەخۆوە دەبینێ و منیش بە سەری مانگەوە) ! ئەو قسە لە کاتێکدا دەکات کە لە کوردستان بەردەوام موچەی کارمەندان دراوە، بە پێچەوانەی حکوومەتی حەماس کە بە هاتنیان موچە کۆتایی هات و پێیان دابین نەکرا.

ئەوەی جێگای سەرنجە، سەرۆکی کوردستان و سەرکردایەتی سیاسی بزووتنەوەی شۆرشگێریی، لە بۆ چەسپاندنی ئامانجە مێژووییەکانی کوردستان، حیکمەت و خۆڕاگرییەکی زۆری نواندووە و دەسکەوتی زۆر گەورەی لەو ئامانجە مێژووییانە بەدەستهێناوە. بە روانگای روونیشەوە پرۆژەی سەربەخۆیی کوردستان و ئاوەدانکردنەوەو پیشەسازیکردنی وڵاتیان لە بەرنامەی کاری رۆژانەدایە. ئەم سەرکردایەتییە متمانەی یاسایی خەڵکی کوردستانی لە پشتە و ئیعتبارێکی نێودەوڵەتی بەهێزی هەیە. دادپەروەری کۆمەڵایەتی و سیاسەتی نەهێشتنی هەژاری بەشی سەرەکی پرۆژەی ئێستای سەرکردایەتی و حکوومەتی کوردستانە. هەموو وڵاتانی پێشکەوتوو و ئاوەدانی دنیا بەم ئەزموونەدا تێپەڕیون، بۆیە بە دڵنیاییەوە کوردستانیش بە هەر ساڵێك دەهەیەك دەبڕێت و توانای ئەوەشی هەیە دیاردە دزێوەکان بنەبڕ بکات و بە هەنگاوی پتەو بەرەو کۆمەڵگایەکی هێمن وکامەران و مەدنی بچێت.



## بەشی دووەم:

## گرفتی گەندەڵی و خواستی شەفافییەت لە کۆمەڵگای کوردستاندا

مەسەلەی شەفافییەت پەیوەندییەکی زۆر پتەوی بە متمانە هەیە لە نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگا و بزووتنەوەی سیاسی و خەڵك بەگشتی. پەرەسەندنی سەرمایە و دەوڵەمەندبوونی وڵات و پەیدابوونی نەخۆشی گەندەڵی ئەوانە هەموو پەیوەندییەکی نزیکیان پێکەوە هەیە. ئەم چوار چەمکە لەمرۆی پێشکەوتنی سیاسی و ئابوری وڵاتەکەماندا مناقەشەیەکی زۆریان لەسەرە. رۆژانە نەخۆشیەکانی دەبینین و لەگەڵی دەژین، ئەو ئاستەنگانەش لەبەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی ئێمە دەخولقێندرێن هەموومان هەستی پێدەکەین، چ ئەوانەی دەستیان لە بەرێوەبردنی کاری وڵاتدایە یان ئەوانەی کە ئۆپۆزسیۆنن، هەروەها ئەوانەی بەشێوەی بێ لایەن و ئاکادیمی کاری لەسەر دەکەن، هەر یەکەیان ئەم واقیعە لە زاویەی تایبەتی خۆیەوە دەبینێ. پێشموایە هەوڵی هەمووشیان بۆ ئەوەیە تا بکرێ لە ئێشوئازاری ئەو دیاردانە کەمبکرێتەوەو وڵاتەکەمان بە خێرایی ئەو قۆناغە تێپەڕێنێ.

دەمەوێ بڵێم پێویست ناکات لە ئەلف و باوە دەستپێبکەم. بۆیە راستەخۆ دەچمە ناو بابەتەکە. هەردوو چەمکی گەندەڵی و شەفافییەت لە تایبەتمەندییەکانی وڵاتانی سەرمایەداری لە رووی تکنۆلۆژیا و کۆمەڵایەتی پێشکەوتوون، ئینجا دیموکراسییەکەیان هەر لەبواری سیاسیی نییە بەڵکو جیل لە دوای جیل تێکەڵ بووە لەگەڵ پەروەردەو ژیانی کۆمەڵایەتییان. جابۆیە دروستبوونی میکانیزمێك بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی کە

شەفافییەت دەسەپێنێ و میکانیزم دروست دەکات بۆ ئەوەی ڕێگا لە گەندەڵی بگرێ و تێکەڵی کەلتوریان نەبێ، لەوێدا کارێکی ئاسانە.

لە وڵاتانی پەرەئەستێن(الدول النامیە) کە ڕێژەی خوێندەواری یەکجار نزمە و سەرمایە بەو مانایەی لە دنیادا پێیدەگووترێ سەرمایەداریی (کاپیتالیزم) دروست نەبووە. پارە هەیە بەڵام پارەی نەوتە نەك هی بەرهەمهێنان. دیموکڕاسی لە ئاستی سیاسی کە ئەویش ڕێککەوتنە لەنێوان حزبەکان، تێنەپەڕیوە. جا دێمە سەر ئەو چەمك و قەناعەتە کۆمەڵایەتی و کەلتوری و دینییانەی لەوانەیە هاریکار نەبن بۆ چەمکی شەفافییەت و ڕێگەگرتن لە گەندەڵی. هەر ئەوەش وایکردووە لەسەر ئاستی دنیا ڕێکخراوی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و بانکی دەسترۆیشتوو دروست بن و میکانیزمی دیراسەکراوی واقیعیانەی بەهێزیان هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی و لێکۆڵینەوە لەو سەرمایانەی بەبێ پێشینە دروست دەبن. شەفافییەت وای لێهاتووە هەموو وڵاتان وەك زانستێك لێی بەهرەمەند بن. چونکە لە قۆناغی جیهانگیریدا سەرمایە خسوسیەتی جیهانی هەیە و لە هەر شوێنێك دیاردەی گەندەڵی پەرەبستێنێ ئەوە نەخۆشیەکانی دیکەش بەدوای خۆیدا دێنێ و زەبر لە سەرمایەی جیهانی دەدات. هەر ئەوەش وایکردووە ئەو ڕێکخراوە جیهانیانەی پەیوەندییان بەم دۆزەوە هەیە گوشار دەخەنە سەر ئەو وڵاتانە کە گەندەڵییان تێدایە و شەفافییەتیان نییە، چونکە ئەوانە هەردووکیان هەڕەشەی گەورەن لەسەر ئارامشی کۆمەڵایەتی و داهاتووی دیموکڕاسی.

لەم لێکۆڵینەوەدا هەوڵدەدەم باسێك لە شەفافییەت و قسەیەك لەسەر گەندەڵی و خسوسیاتی قۆناغی ڕزگاریخوازی وڵاتەکەمان بکەم، چونکە تا ئەو ڕۆژەی ئاڵای ئێمەش لە تەنیشت ئاڵای وڵاتانی دیکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵنەدرێ و نەبینە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەو گرفتانەمان هەر دەمێنن. ئایا ئەمە چەند وادەکات گەندەڵی و ناشەفافییەت بەردەوام بێ؟ دەسەڵاتی شۆرشگێڕەکانی کوردستان تا ئێستا بەردەوامە، ئایا بەدیلی هەیە؟ ئەو کێشانە چەند ڕێگە بۆ گەندەڵی و نەبوونی شەفافییەت خۆش دەکەن؟ دیموکراسی و گەندەڵی چ پەیوەندییان پێکەوە هەیە؟ دەکرێ ئێمە وڵاتێکی



دیموکرات بین و ڕێگەش بە دیاردەی گەندەڵی بدەین؟ دیاردەی گەندەڵی لە وڵاتی ئێمە تا چ رادەیەکە، ئایا هەیە؟ ئەگەر هەیە چەند موبالەغەی تێدا دەکرێ؟ چەند ڕێگرە لەبەردەم پێشکەوتن و بەدەزگایی بوون؟ ئاسەواری شەری نێوان ئێمە و عێراق و قۆناغی ئەنفال چ کاریگەرییەکی لەسەر دروستبوونی ئەو کەلتورە کردووە کە ئێستا پێیدەژین؟ ئایا ئەوانە چەند ڕێخۆشکارن بۆ پەیدابوونی دیاردەی گەندەڵی؟ ئەگەر دیاردەی گەندەڵی بەشێك بێت لە قەناعەتی کۆمەڵایەتی، چەند زەحمەتە بتوانرێ میکانیزمێك بۆ شەفافییەت دابندرێ؟

ئەوانەی دەیانپرسم مەحاڵ نین بەڵام دەبێ جارێك تەماشای قەدوباڵای کۆمەڵایەتی خۆمان بکەین تا بزانین ئەم شتانە لە کوێوە پەیدابوون. ئەو حکوومەتەی پارە دەبەخشێتەوە و مووچە دەداتە هەموو هاووڵاتیان، ئاساری ئەم سیاسەتەی دەیگەیەنێتە کوێندەر؟ ئەو میللەتەی مووچە لە حکوومەتەکەی وەردەگرێ دەتوانێ زمانی خۆی درێژ بکات؟ دەتوانێ لەسەر بەرهەمهێنان خۆی رابێنێ؟ کەسێك بەرهەم نەهێنێ دەتوانێ جورئەت بنوێنێ؟ ئەو کەسەی جورئەتی نەبێ شەفافییەتی بۆ چییە؟ جا ئەگەر شەفافییەت نەبێ ئایا دیموکڕاسی دروست دەبێ؟

مەترسی سامانی نەوتی ئێمە و ئەو پارەی کە دەرژێتە ناو میزانیەی حکوومەت و بە شێوەیەك شۆر دەبێتەوە ناو ماڵەکانی ئێمە، بە چاك و بە خراپ چ مەترسیەکی هەیە بۆ سەر داهاتووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیمان؟

ئەگەر پێڕابگەم دەیەمین قسەشم دەکەم کە شەفافییەت ژمارەیەك بنەمای پێویستە و پرسیار دەکەم ئایا لە وڵاتی ئێمەدا هەن؟ ئەگەر نین چۆن دروست دەکرێن؟

شەفافییەت یەکێك لەو چەمکە سیاسی و ئیداری و ئابووریانەیە دوای ساڵی **٢٠٠٣** هاتە ناو قاموسی سیاسی وڵاتی ئێمە. پێش ئەوە کەمتر جێی باس بوو. لەوانەیە لەبوارە ئاکادیمییەکاندا باس کرابێت بەڵام چونکە پێویستییەکی زۆر بە پەلەی کۆمەڵایەتی و ئابووری نەبوو، پێش **٢٠٠٣** زۆر ئاوڕمان لەم چەمکە نەدەدایەوە چونکە ئیشمان پێی نەبوو. لە هەرێمی کوردستان لەناو دوو گەمارۆی زۆر گەورەدا بووین، حکوومەتی عێراق بەو هەموو چەکە جەبەروتەی هەیبوو لە قوشتەپە و فایدە و چەمچەماڵ سەنگەری





لێگرتبووین. هەرێمێك بووین هەر بۆ خۆمان بریاری قانوونەکانی خۆمان دەدا و کەس نەیدەگووت قانونەکانتان بایی چەندە. لەوکاتدا سەرمایە زۆر کەم بوو، لەسەر ترانزیتی نەوت دەژیاین، ترانزیتەی ئەو بازرگانییە قاچاغەی لەنێوان تورکیا و کەسوکاری سەددام حوسین دەکرا. هەرکاتێکیش ویستبایان زەختێك بخەنەسەر کوردستان، ئەم رێگایەشیان دادەخست و ئەوجا حکوومەتی ئێمە نەیدەتوانی موچەی کارمەندەکانیشی دابین بکات. بۆیە شتێك بەناوی گردبوونەوەی سەرمایە و دروستبوونی شەریکات و پەیدابوونی گەندەڵی نەبوو. ئێمەش پێویستمان بە چەمکی شەفافییەت و گەندەڵی نەبوو. تێربوونی سك گرنگ بوو، دابینکردنی ئاسایش و پێکهاتنەوەی پارتی و یەکێتی گرنگ بوو. ئەوانە هەمووی لە پێشەوەی ئەلف و بای وڵاتێکی مستەقری دەوڵەمەند دێن کە چەمکی گەندەڵی و شەفافییەت دەکەوێتە ناو قاموسی ژیانی رۆژانەیان.

ئێستا دۆخ جیاوازە چونکە پارە زۆرە، هەندێك جار تەنگژەی تێدەکەوێ بەڵام هەیە. ئەم پارەیە لە رێگای بەرهەمهێنان و پەیدابوونی کارخانە و ئیشی خەڵکەوە نییە، پارەی سامانی ژێر زەوییە پارەی نەوتە. ئەوەش دوای کاروانێکی درێژی دزی و فزی هێزەکانی نێودەڵەتی و نەتەوە یەکگرتووەکان و حکوومەتی عێراق، لە کۆتاییدا چۆڕاوێکی کەمی دەگاتە کوردستان کە ئەوەش لەخۆیدا پارەیەکی زۆرە.

دوای قۆناغی ساڵی ٢٠٠٣، دیاردەی گەندەڵی لە هەموو عێراق، بەتایبەتی لە کوردستان، جا زیاتر برۆ لە رێکخراوەکانی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە سوپای ئەمریکادا، لە حکوومەتەکەی بریمەر کە بە (CPA)ناسراوە، هەموویان بە کردەوە بەشداری هێنانی دیاردەی گەندەڵی بوون بەو شێوە نوێیەی ئێستا. بەشی هەرە زۆری سەرمایەی عێراق بووەتە مایەی یەکدی تاوانبارکردنی ئەمریکاییەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان. لەوانەیە ئەم مەسەلەیە پەرەبستێنێ چونکە دزی یەکەم ئەوان بوون دوایی دەسەڵاتدارە چ نەدیتکەکانی ئێستای عێراق، ئەوانەی بە جۆرێك لە دیموکراسی سیاسی هاتنەسەرکار کەچی ئەو بەڵایە بەسەر شیعەو سوننەدا دێنن کە دەیبینین.



بەم قسانەم نامەوێ پاساو بۆ دیاردەی گەندەڵی لە کوردستان بێنمەوە یان خاتری لێپرسراو و دەزگا گەندەڵەکان بگرم بەڵام پێویستە بزانین دیاردەی گەندەڵی بەو سەیتەرانەدا تێپەریوە. جا سەیر بکەن ئێمە ناچارین لەگەڵ عێراق بمێنینەوەو یاساکانیان لەگەڵ شیبکەینەوەو نەخشەی داهاتووی عێراقیان لەگەڵ بکێشین. جا بڵێین یان نەڵێین ئەو دیاردەیە بە ئاسانتر و خێراتر پەرەی سەند. کاربەدەستانی کوردیش لە بەغدا کار و سیاسەت دەکەن، ئەوانەی بەغدا و ئەمریکاییش دێنە ئێرە. رێکخراوەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکاییەکان یان ئەوانەی لە ئەوروپاوە دێن (من نازانم رێژەیان چەندە) بەڵام گەندەڵی یەکەم ئەوانن. ئەوەی بەناوی راهێنان و وۆرکشۆپ دەیکەن هەمووی وەسیلەیە تا بەشێك لە سامانی نەوتی عێراق بۆ خۆیان بەرن. تا ئێستا ئەم کارە بەردەوامە.

شەفافییەت یان روناهی خسوسیەتی ئەو نیزامە هاووڵاتەیە کە سەرمایەی وڵاتەکەی ناشارێتەوە و ئەو تەنزیمە ئابوورییەی بۆ پەرەپێدانی نیزامی ئابوری و بەرهەمهێنانی وڵاتەکەی دەیکات بە دەنگی بەرز لە پەرلەمان یان لەسەر سەکۆیەکانی دیکە مناقەشەی دەکات و دەگاتە ئەو نیزامە ئابوورییەی کە پێیوایە لە خسوسیاتی وڵاتی ئەودا مناسبە و دەگونجێ. هیچ بوارێك لەوانەدا ناشارێتەوە. لە نیزامی معاشدانەوە تا دەگاتە فرسەتی کۆمپانیاکان و ئەو پرۆژانەی بۆ بەرهەمهێنان پێشنیاری دەکەن. شەفافییەتی سیاسیش هەیە کە جاری یەکەم لە ساڵی٢٠٠٣ بووە باو کە بریتییە لە نەشاردنەوەی راستییەکان. ئەو کاتەی گفتوگۆ و دان و ستاندن دەکرێت ئەو پەردەیەی دپلۆماسییەت دروستی دەکات کەمێك تەنك بکرێتەوە تا خەڵك بزانێت سەرکردە سیاسییەکان لەسەر چارەنووسی وڵات چۆن بیردەکەنەوە. شەفافییەتی سیاسی بەلای خەڵکەوە گرنگە بەڵام مەودایەکی کورتی هەیە و لەمرۆوە تا سبەینێ بڕدەکات. خۆ ئەگەر ئاسایشی نەتەوەیی بخوازێ ئەوە دەکرێ هەندێك بیرورا بشاردرێتەوەو میللەتیش چاوپۆشی دەکات، بە مەرجێك دوایی بۆی روون بکرێتەوە. بۆیە شەفافییەتی سیاسی پێویستە بەڵام دەبێ کارێکی خێرا بێت چونکە گۆڕانکارییەکان خۆیان خێران و ئەو میکانیزمە دەخوازن. ئەوەی بەلای خەڵکەوە گرنگە





شەفافییەتی ئیداری و ئابوورییە و لەسەری دەوەستن. دەپرسن کادری ئیداری لەسەر چ بنەمایەك دادەندریٚ؟ سەرمایەی وڵات، مووچە و ئیمتیاز و فرسەتی کۆمپانیاکان، کاری سەرمایەدارەکان چەند بە ریٚگای حەقیقی خۆیان دراون؟ یان چەندیان لە ریٚگای بەرپرسە سیاسییەکان و مەحسوبیەتی تایبەتییەوە ئەم دەرفەتانەیان پیٚدەدریٚت؟

شەفافییەت لە بواری سیاسی و ئابوریدا پەیوەندییەکی نزیکیان پیٚکەوە هەیە و وەك یەك پرۆسە تەماشا دەکریٚن. کاتیٚك لە کاری شەفافییەتی سیاسی، رووداوەکان لە خەڵك نەشاردرانەوە، کەواتە خەڵك لەسەر دیموکراسیی سیاسی رادیٚت، وەك فرەیی سیاسی و ئازادی بیرورا. جا ئەگەر لەسەر ئەمیان راهات، دوایی داوا دەکات شەفافییەتی ئابووریش هەبیٚت کە سامانی وڵات دابەش دەکات و میکانیزمەکەی ئاشکرا بکریٚت. ئەوکاتەی ئەو میکانیزمە ئاشکرا نەکرا ئەوە گەندەڵی لەویٚوە دەستپیٚدەکات. گەندەڵی ئابووری پەیوەندی راستەوخۆی بە گەندەڵی ئیداریشەوە هەیە. گەندەڵی ئیداریش پەیوەندی راستەخۆی بە گەندەڵی سیاسییەوە هەیە.

کاتیٚك گەندەڵی سیاسی لە وڵاتەکەماندا هەبیٚ، وا باشە بە شتیٚکی سەیری تەماشا نەکەین. چونکە ئەگەر کۆمەڵگایەکەمان پیٚکدیٚت لە بەرەبابی گەورە گەورە و عەشیرەت و لە دین و نەتەوەی لیٚکدی جیاواز، ئەمانە جۆریٚك لە ناسنامەو ئینتمای بچووك دروست دەکات کە لە خیٚزانەوە دەستپیٚدەکات و دەگاتە عەشیرەت و ناوچە و دین. لە کاری سیاسیدا ئەو کەسانە لیٚکدی کۆدەبنەوە. کاتیٚك شۆرشگیٚڕەکان دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن و خەڵکی دیکەش بەشداریان دەکەن، ئەو پیٚکهاتانە دەگوازریٚنەوە ناو دەسەڵات. هەربۆیە دەبینی برای فلاٚن کەس ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتییە یان ئەندامی کارگیٚری مەکتەبی سیاسی یەکیٚتییە لە فلاٚن جیٚگا خاوەنی فلاٚن کۆمپانیایە. ئەو نموونە وادانیٚین کە پاسەوانەکانی سەرۆ قادر کەسوکاری خۆنی، باشە بۆ خەڵکی دوور ناهیٚنیٚ تا بیپاریٚزن؟ هەر ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە وا دەکات کە دەیگوازییەوە بۆ ناو حکوومەت، ئاگاشت لیٚ نییە ئەو پیٚکهاتەیە دەگوازیتەوە ناو ئیدارە. ئەوە تەنیا خسوسیەتی کوردستان نییە، هی هەموو وڵاتانی پەرەئەستیٚنە. هەربۆیەش لە دەوڵەتانی عەرەبی و



ئاسیایی، خیٚزان، عەشیرەت یان مەزهەب یان پیٚکهاتەیەکی لەم جۆرە دەست بەسەر دەوڵەتدا دەگرن. زۆر جاریش دەستبەسەرداگرتنەکە لە جۆری کودەتایی نییە بەڵکو خشانیٚکی کۆمەڵایەتییە دیٚتە ناو دەسەڵاتی سیاسی، ناخوداگا(لیٚرەدا مەبەستم ناخوداگایی موتلەق نییە ) دەتەیٚنیٚتە ئەو ئاستە ئیدارییە کە دەرگا بۆ گەندەڵی دەکاتەوە.

لە وڵاتانی هەژاردا گەندەڵی درەنگ دروست دەبیٚت چونکە پارە بە ئاسانی دەستناکەویٚت. بەڵام وڵاتی ئیٚمە جیایە. چۆن ژیٚردەستەیی و درەنگ رزگاربوون، کارەساتەکانی کە لە میٚژوودا نموونەیان کەمە وەك ئەنفال و کۆکوژی و راگواستنمان بەسەردا پەیرەوکرا، بەپیٚچەوانەوە سامانەکەمان بە ئاسانی دەستدەکەویٚ ئەویش نەوتە و لەژیٚر زەویەکەماندایە. هەر ئەو نەوتەیە کە وایکرد دوای سەد ساڵ تیٚکۆشانیش ئینجا هەر رزگاری یەکجارەکیمان دەستنەکەویٚ. ئاڵۆزییەکی یەکجار گەورەمان لەپیٚشە و پیٚچیدەیەکی زۆرمان دیتووە تا هەریٚمی کوردستان توانیویەتی بەم شیٚوەی ئیٚستا خۆی بپاریٚزیٚت. جا ئەگەر ئەوە واقیعە میٚژوویەکەمان بیٚت، لەو لایەوە ئیٚستا لەم قۆناغەماندا هیچ ماندوو نابین و پارەیەکی زۆرمان هەیە. خۆ ئەگەر سامانی نەوت هەمووی بۆ کوردستان بگەڕیٚتەوە کارەساتی ترسناك ئەوکات لەناو کۆمەڵگای کوردستان روودەدات. ئەو کارەساتە حکوومەتی کوردستان و نیزامی دیموکڕاسی و جیلی داهاتووش دەگریٚتەوە. گەندەڵی سیاسی ئەوەیە کە من برایەکەی خۆم بکەم بە جیٚگری پاریٚزگاری فلاٚن شارە یان بیکەم بە قایمقامی فلاٚن شویٚنە یان بیکەم بە ئەندامیٚکی دەستڕۆیشتووی فلاٚن لیژنە، لە هەمان جیٚگا دەرفەت دروست دەبیٚ کە ریٚگا بە کەسوکاری خۆت دەدەی لەکاتی تەوزیعکرانی سەرمایەی وڵات جۆگەیەکی لیٚهەڵدەبەستیٚ و پاساوی یاساییشی بۆ دروست دەکات و بەڵگەنامەشی بۆ دروست دەکات. ئەوەیە کە دەبینی یەکیٚك لە پڕیٚکا زۆر دەوڵەمەند دەبیٚت. ئەوانەش یەك دوو نین بەڵکو سەدان و هەزاران دەوڵەمەندی مشەخۆرن. ئەوانە لەریٚگای بەرهەمهیٚنانی ئاسایی و منافەسەی ئابووری دەوڵەمەند نابن. دەوڵەمەندی ئاسایی درەنگ پیٚدەگات و کارەکەی دیارە و ریٚوشوین و نەریٚتی خۆی هەیە





و کەلتوری تایبەتی بۆ دەوڵەمەندەکان هەیە. ئەم دەوڵەمەندە ئاساییانە وڵاتیش دەوڵەمەند دەکەن و دەستی کار بەگەڕ دەخەن، بۆیەش بە ئاسانی دروست نابن. ئەگەر وابا دەبوو لیبیا گەورەترین وڵاتی سەرمایەداری ئەفریقیا بوایە چونکە زۆرترین نەوتی هەیە. کەچی لە شوێنێك یان لە سمینارێکی ئابووری، سەرمایەدارێکی لیبیایی نابینی. سەدام لە کۆبوونەوەیەك لەگەڵ هەندێك لە دەوڵەمەندەکانی بەغدای کردبووە، پێی گوتوون ئێوە هەمووتان کوڕی شۆڕشن و ئەو سەرمایەی هەتانە سەرمایەی شۆڕشی حەڤدەی تەموزە "لعنە النفـط". سەددام حوسێن راستی دەگووت چونکە ئەو دەوڵەمەندانە هەموویان بەرهەمی گەندەڵی سیاسی و ئیداری و ئابووری خۆی بوون، هیچیان سەرمایەداری دەستی کارو بەرهەمهێنان نەبوون. سەدام حوسێن هەر خۆی نەیدەهێشت ئەو نۆعە سەرمایەدارە رەسەنانە دروست بن.

لە کوردستان زۆر جار دەڵێن گەندەڵی سیفەتی فلان حزبە. کەچی دەبێ بزانین گەندەڵی سیاسەت نییە بەڵکو لادانە، هەروەك چۆن نەخۆشیەکانی دیکە لە تاکە کەسدا دروست دەبێ وەك لاساری و لادانی رەوشتی و کوشتن و دزی و لادان لە بنەما ئەخلاقییە باوەکان، ئەوانە لە زانستدا پێیدەگوترێ نەخۆشی. لادانی پارەی وڵاتیش بەبێ ئیشکردن و ماندوو بوون بەشێکە لەو نەخۆشیە کۆمەڵایەتیانە، ئەو کەسە نەخۆشە کە ئەم کارانە دەکات. بۆیە ئەوانەی لە پانتایی گەندەڵی ئابووریدان ئەوانە کەسانی لادەرن تەنانەت ئەگەر شۆڕشگێڕیش بووبن. ئەمە سیفەتێکی ئاڵۆزە یەکێکی شۆڕشگێڕ لەوانەیە گەندەڵ بێت! ئەم دیاردانە ئاراستە و دیقەتی کۆمەڵایەتی بەسەهو دەبەن. لە وڵاتێکی وەك هی ئێمە کە نەخوێندەواری زۆرە، زەحمەتە چەمکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە کابرای نەخوێندەوار بگەیەنی. ناتوانی چۆنیەتی پێشکەوتنی بەرهەمهێنانی تێبگەیەنی و بزانێ شەفافییەت چەند پێویستە. لە کۆتاییدا ناتوانین کابرای نەخوێندەوار حاڵی بکەین کە حەقی تۆ نییە سامانی وڵات بۆ بەرژەوەندی خۆت بەلاوە بنێی. بۆیە ئەو دەنگە بەرزەی کەوا زیاتر لە ساڵێکە هاوار دەکات گەندەڵی هەیە و لێپرسراوان گەندەڵن، خۆ ئەم قسەیە زۆری راستە بەڵام ئایا لە پشت ئەو قسانەوە پرۆژەیەك دەدەنەدەستەوە بۆ کۆتاییهێنانی گەندەڵی؟ یان(



لەم قسەیەم بەرپرسم) کەلتوری وڵاتەکەمان خۆزگە بە گەندەڵی تێدایە؟ لە قوڵایی ئاهەنگی دەنگەکاندا شتێك هەیە ئاماژە دەدات: دە کاکە جێی منیش بکەوە با هەندەکی بخۆم! ئەوە هیچ بەدیلی بۆ لابردنی گەندەڵی پێنییە تاکو وڵات بکەوێتە سەر رێچکەیەکی دروست و لادان نەمێنێ.

لە کەلتوری رۆژهەڵاتی ناوەراست و ئیسلامیدا چەند دەریچەیەك هەیە کەوا رێگا لەبەردەم هاووڵاتی دەکاتەوە بڕوا پەیدا بکات خواردنی مڵکی دەوڵەت حەرام نییە چونکە ماڵی خودایە. لەلایەکی دیکە ئەوە سەد ساڵە، میللەتی کورد لە دژی حکوومەتی عیراق تێدەکۆشێ و قەناعەتێکی بۆ دروست بووە وەك بەشێك لە کەلتور کە چۆنی بۆی بلوێ زەبر لە حکوومەت بدات چونکە هەر بە دوژمنی خۆی زانیوە. ئێستا بە ماوەیەکی کورت ناتوانێ ئەم دوو بڕوا کەلتورییە بسڕێتەوە. لە کەلتوری رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بوار بۆ پەرەسەندنی سەرمایەداری نییە بۆیە یەك وڵاتی سەرمایەداریی نابینی. ئەگەر کوردستان سەد ساڵ بە تاخیرەوە بووەتە نیمچە دەوڵەت، وڵاتانی دیکە هەیە ئەوە سەد ساڵە سەربەخۆیە و نەبووەتە دەوڵەتێکی سەرمایەداریی تا ئێستا هەر سەرچاوەو لانەی گەندەڵییە. بۆ نموونە وڵاتانی کەنداو بەتایبەتی شانشینی سعودیە کە سەرزەمینی پیرۆزی موسوڵمانانیشە دێنمەوە کە گەندەڵترین شوێنی ئەم دنیایەیە! بۆچی سەرچاوەی فکری و مالی ئەو هەموو تیرۆرەیە کە دنیای تێکداوە؟ کەواتە لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی کەلتوری ئێمەدا کە دین و بزووتنەوەی رزگاریخوازییە، باوەڕ و چەمك دروست بوونە، یارمەتیدەرن تا هاووڵاتی بەبێ ئازاری ویژدان و ماندوبوونی جەستەیی و فکری، چاوی لێبێت پارەی مۆڵی بۆ کۆببێتەوە. قسەیەکی کوردەواری هەیە دەڵێ زۆر خۆشە لە پڕێکا ببیتە کوڕێك. واتە ئەگەر هیچ کارت نەکردبێ بۆ سبەینێ ببیتە دەوڵەمەندێکی گەورە، هیچ ماندوو نەبوویت دەبیتە وەزیرێکی زۆر عەنتیکە، هەوڵێکی ئەوتۆت بەکارنەهێناوە دەبیتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. خۆ ئەوانە هەموو ئیمتیازن. کەواتە گەندەڵی و نەبوونی شەفافییەت ئەگەر لای ئێمە زەمینەیەکی نێودەوڵەتی هەبووبێ، ئەوە زەمینەیەکی دیکەی کەلتوری و دینی هەیە. نابێ بیشارینەوە لە ناو کەلتوورەکەماندا





کەرستەی کەلتوری سیاسی عێراق هەیە، ئەمە بە حکوومەتەکانی عێراق و بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانیشەوە.

دوای ساڵی ١٩٩١ پاشەکشە بە عێراق کرا و پێشمەرگە هاتەوە ناو شار. لەسەر میللەتێکی ژێردەستەدا حکوومەتێکی شۆڤێنیست لە سیستەم و فاشیست لە سیاسەت و رەفتاردا هەبوو کە نەیهێشتبوو ئەم ناوچەیەی کە خۆی پێیدەگووت باکوری عێراق، هیچ شارەزاییەکی کارگێری و سیاسی تێدا دروست بێت. بە پێچەوانەوە گەمارۆ درابوو، بەردەوام کاری لەسەر دەکرا بۆ کوشتن و شێواندن و روخاندنی شەخسیەتی تاکەکانی. ئەو وڵاتانەی لە شەری گەورە رزگار دەبن شێواندنی کەسایەتی و کۆمەڵایەتی بەڵایەکی ئەوەندە گەورەیە بە ئاسانی لەدەستی قورتار نابن. جا ئەوە بەڵایەك نییە تەنیا بە نەوەی بەڵادیتو کە پاش ماوەیەك دەمرێ، کۆتایی بێت، کارەسات ئەوەیە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەی دووەم و سێیەم. چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشی و لەبارچوونە بە سیستەمێکی پر پرۆگرامی بیرلێکراوەی حکوومەت دەکرێ کە بتوانێ لە پەروەردە و هوشیارکردنەوەی کۆمەڵایەتی، یارمەتیدانی رێکخراوە مەدنییەکانیش بدات تا بتوانن یارمەتی هەڵسانەوەی تاکەکانی ناو کۆمەڵ بدەن و لە ئاسەوارەکانی جەنگ قورتاریان بێت. بۆ نموونە دەبێ چاوەروانی چیمان لە گەنجێك هەبێت کە بستێك منداڵی ساوا بووە بەبەرچاویەوە باوکیان برد و ئەنفالیان کرد، گوندەکەشیان وێران کرد و لە هەولێر بە سواڵ ژیاوە، ئێستا تەمەنی سی ساڵە. دەتەوێ پیاوێکی شەفاف و ناگەندەڵ و هێمن و زانا بێت؟ یان لەوانەیە پیاوێکی عەسەبی و چ نەدیتکەی دەستەوستان کە قەت تێری نەخواردووە، ئێستا سامان بکەوێتە بەردەستی لەوانەیە وا بزانێ رۆژێکە و دەبێ لێیبدا و بروات! سەیری ئەو کارەساتە بکە، قوربانیدەرترین خەڵکی وڵاتەکەت لەوانەیە گەندەڵترین کەسی کۆمەڵگاکەتی لێدەرچێت! ئەمە سوکایەتی پێکردن نییە، واقعیەتە. ئێمە میللەتێکین خاوەنی ئەم کارەساتانەین و ئەوانەی لێرە دانیشتووین ئەو کارەساتانەمان تێپەراندووە. مرۆڤی کارەساتدیتوو ناکرێ فرشتەی لێدەرچێ و هیچ لاری پێوە دیارنەبێ. با شوبهاندێکی ئەمەی گووتم بە خۆم بێنینەوە: خۆ من توانایی سەگم نییە لە هەموو قوڕ و چڵپاوێکم بدەن، دوایی بڵێن خۆت



راوەشێنە هیچ پیسیت پێوەنەمێنێ. روحی ئینسان شەفافترین دیاردەی سەر ئەم زەمینەیە کە هەموو قۆپاندن و ئازارێك، شوێنەواری بەسەرەوە دەهێڵێ و گرفتی گەورەی مرۆڤ ئەوەیە بە ئاسانی لەدەست ئەم شوێنەوارانە قورتاری نابێت. بۆیە کاتێك عێراق پاشەکشەی لە کوردستان کرد، تاکە بەدیلی دەسەڵات بەرێوەبردن، بزووتنەوەی شۆرشگێریی بوو.

لەناو بزووتنەوەی شۆرشگێریی، چەمکی دیموکراسی تەنیا لە پەیرەوپرۆگرامدا هەبوو، کە چی رۆژگار نیشانیداین دیموکراسی شتێکی دیکەیە و تەنیا خوێندنەوەی کیتێبان نییە، جێبەجێکردنیشی کارێکی ئاسان نییە. بە تەجرەبە دەرکەوت زانکۆ و پەیمانگاکانی کوردستان وا دروستکراون کە مەکینەی دروستکردنی ئەو کەسایەتییە روخاوانە بن کە فاشیزم و حکوومەتی شۆڤێنیستی عێراق دەیەویست. خۆیان دەیانویست زانکۆکان لەم چەشنە بن چونکە ئەوە نیزامی سیاسییە بەرزی و نزمی ئاستی زانکۆکان دیاری دەکات. من لەو کەسانە نیم سوکایەتی بە هیچ ناوەند و هەولێکی زانستی بکەم، بەڵام سەیر بکە زانکۆی بەغدا چ کەسانێکی لێدەردەچن؟ جا سەرباری ئەو هەموو هاوکارییانەی بە زانکۆکانی هەولێر و دهۆك و سلێمانی کرا، لە ماوەی چواردە ساڵدا نەیانتوانی ستافێکی ئەوتۆ بخەنە مەیدان کە بۆ بەرێوەبردنی وڵات نەك بەدیل بەڵکو هاوکارێکی باشی کادری شۆرشگێر بن. بۆیە هیچ منافەسەیەك لەم بوارەدا نییە و ئەمەش خۆی کارەساتێکی دیکەیە. تەمایەکی دیکەمان بە رەوەندی کورد لە دەرەوە هەبوو تا شارەزامان بۆ بنێرنەوە. کاتێك بۆ هاتنەوەیان دەرگا کرایەوە، جیا لە ژمارەیەکی زۆر کەم، دەرکەوت بە غەیری کارکردنی پەراوێزیی ئەوروپا هیچ بوارێکی دیکەیان نەبووە. ئەوەش دەرفەت نادات کادری دەوڵەتمەدار دروست بکات. لە دوا وێستگەدا منافەسەی سیاسیی و شەری ناوخۆ لەناو کوردستاندا لێنەگەرا سەرکردایەتی سیاسی دەرفەتی پێگەیاندنی کادری شۆرشگێری هەبێت تا ئەو کەسانەی تواناییان تێدایە وردە وردە بخوێنن و پێشبکەون. ئاخر دەرفەتی پانزدە ساڵە یەکجار زۆرە، هەر پێنج ساڵ بەسە تا ستافێك پێبگەیەندرێ، بۆ ئەوەی بەلای کەمەوە توانای بەرێوەبردنی وڵاتی هەبێت و گرفتەکانی کەمتر بێت. ئەو

جێگۆڕکێیەی لە پۆستی وەزیرەکان و پۆستەکانی دیکەدا دەکرا چ ئەنجامێکی هەبوو؟ هەیە چوار جار کراوە بە وەزیر و لابردراوە، روون نەکرایەوە ئەو وەزیر و بەرێوەبەرەی لەو ماوەیەی لایانبردبوو ناردیانە خوێندن، دەورەیان پێدیت یان دەرفەتێکی بۆ رەخسا شتی نوێ فێر بێت؟ وەڵامەکەی نایە، چونکە منافەسەی حزبی بووە پێوەر بۆ ئەوەی کێ جێی کێ بگرێتەوە. هەر ئەوەش بوو لە کابینەی یەکەم و دووەمدا دەیانگووت جێگری وەزیر رێگری وەزیرە، وەزیریش قاتلی جێگرەکەیەتی. لە شەڕی ناوخۆدا دیتمان چۆن وەزیر جێگرەکەی خۆی دەگرت.

ئەمە تەجرەبەی کوردانە لە وڵات بەرێوەبردندا، تەنیا حزبێك بەرپرسیار نییە، ئەمە ئێمەی کوردین و واقیعی کۆمەڵایەتی ئێمە وایە. ئەوە کەلێنێکی زۆر گەورەی لەنێوان کادری شۆڕشگێڕ و میللەت دروست کرد. ئەو پێشمەرگەیەی بە حەیاتی خۆی ئیسراحەتێکی نەکردبوو کە دەبووە وەزیر، بەرێوەبەر، ئاسایش، ئەویش کوری ئەم کۆمەڵگایەیە و ئاوها دەژێت کە بینیوتانە. واتێدەگات دەرفەتێکی ژیانە و دەبێ قەرەبووی مەحرومییەتەکانی بکاتەوە. ئایا بەشێوەیەکی ماقوڵ و قانونی ئەو قەرەبووەی کردووە یان بە پێچەوانەوە؟ هەمووومان ئیعتراف دەکەین کە هەندێك لە لێپرسراوانی ئیداری بە شێوەیەکی ناماقوڵ قەرەبووی رۆژانی شاخیان کردەوە. ئەو تێکۆشەرانە چی مەحرومییەت بوو کێشایان و هەموو رۆژێکیش پڕۆژەی شەهیدیی بوون. هەربۆیە لە ماوەیەکی کورتدا ئەو زاکیرەیە لای خەڵك زیندوو بووەوە کەوا ئەوەی لێپرسراوانی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕ لە ژیانی تایبەتیدا دەیکات، زۆری لەو ژیانە دەچێ کە پیاوانی داگیرکەری عیراق دەیانکرد. ئەمە لە کردەوەی تاکە کەسی هەندێك لێپرسراو دایە نەك لەو نیزامە سیاسییەی کە هەمانە. هەندێك موعاریز و توندرۆ خەڵکیان لەم بوارەدا بەسەهو برد کە گوایە هیچ فەرق لەنێوان دەسەڵاتی داگیرکار و حکوومەتی کوردستان نییە. هەڵەکە لەوەدایە، لەنێوان ئەو دووانەدا فەرق زۆرە، ئەمەیان حکوومەتی خۆتە و کەموکوڕی هەیە، کەچی ئەویان داگیرکەر بوو دەبووا بڕوات.



ئەگەر بگەرێینەوەسەر گەندەڵی سیاسی، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە: یەکیان مەحسوبیەت کە لای هەمووان روونە، تەنیا کەسوکار ناگرێتەوە، مەحسوبیەتی حزبی و سیاسی هەیە. کەنگێ مەحسوبیەت کۆتایی دێت؟ کاتێك متمانە هەبێت. قسەیەکی سەرۆك مسعود بارزانی هەیە کە لە ساڵی ١٩٩٨وە زۆر تاکیدی لەسەر دەکاتەوەو دەیگووت هەموو گرفتەکان ئەوکاتە چارەسەر دەبن کە متمانە بگەرێتەوە نێوانمان. متمانە مانای ئەوەیە کەوا منی سەرۆ قادر لەگەڵ کاك ئەبوبەکر عەلی کە بەرپرسی راگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامییە لە یەك وەزارەتدا بم و هەست بکرێ کە یەکدی ناسرینەوە، ئەوە سەرەرای جیاوازی روانگامان بۆ داهاتووی پێگەیاندنی نیزامی کۆمەڵایەتی کوردستان. بەڵام کاتێك ئەو متمانەیە نەبوو، کە لە بەرێز مام جەلال و سەرۆك بارزانی دێتەخوارتر، دەبینی بڕوا پێکدی بوون شل دەبێتەوە. کەواتە تا متمانە کامڵ نەبێت ئەوە مەحسوبیەتی سیاسی هەردەمێنێ. لەوەشدا هەمووومان سەر بە حزبی خۆمانین جا با پارتی، یەکێتی، شیوعی یان یەکگرتووی ئیسلامی بێت. هەمووشمان کوڕی ئەم کۆمەڵگایەین و دەزانین لەناو دەسەڵاتدا چۆن مەحسوبیەت پەیرەو دەکرێ. ئەگەر ئەو کەلەبەرە هەبوو، ئەوجا کەسوکاریش دێنە ناو معادەلەکە.

ئەو واقیعە کەشێکی وا دەخولقێنێ ئەگەر لەو پانزدە ساڵەدا هەندێك شارەزا دروستیش بووبن، لەو کەشە پڕ مەحسوبیەتەدا، پاشەکشە بکەن. تاجێی شارەزایەك دەکرێتەوە قیر سپی دەبێ، هەندێك جاریش دەریدەکەنە دەرەوە. ئەوە کاتێکە مەحسوبیەت گەندەڵی زۆر دەکات و شەفافییەت ناهێڵێ و رێگانادات شارەزایی جێگای خۆی بگرێ.

کاتێك وڵات بکەوێتە مەترسییەوە، هەموو جیاوازی و کێشەکان کۆتاییان دێت هەموو بەرژەوەندییەکانمان لەوێ کۆدەبێتەوە چونکە بەرژەوەندی باڵای نیشتمان لەسەرەوەی هەموو کێشەو جیاوازییەکان دێت. بۆیە تا نەبینە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەو مناقەشانەی ئێمە و کابینە دوای کابینەکانمان و هەڵبژاردنەکانمان دەکەونە لەرزە، بۆ نموونە ئەگەر یەکجار پۆڵ بریمەر یان فلان ژەنرالی ئەمریکایی یان فلان سەرۆك وەزیری عیراقی بڵێ لە





فلاَن وەعدی خۆم پەشیمان بوومەتەوە. لەوکاتەدایە هەموو کیانی سیاسی ئێمە دەکەوێتە تەنگوچەلەمەوە. ئەوکات دەیانی وەك من دێنەسەر تەلەفزیۆنەکان و دەڵێن: کاکە بەرژەوەندییە گشتییەکە لە خەتەردایە، بۆیە پێویستە هەمووومان یەکبگرین. لە ولاَتانی داچەسپاودا پەنجا ساڵ جارێك شتی وەها روونادات. لە حاڵەتی ئاوهادا بەرژەوەندی سیاسی و شەخسی نامێنی و دەبێ میللەتەکە هەموو تواناکانی تێکەڵ بکات تا لەناونەچێ. کەچی کوردستان ساڵ نییە چەند جار ئەو حاڵەتەی بەسەر نەیەت. بۆیە پێویستە ئەم راستیە بزانین تا پرۆسەی دەوڵەتی سەربۆخۆی کوردستان تەواو نەبێت، دەبێ چاوەڕێ بین کەلێن و کەلەبەر بۆ ناشەفافیەت و ئەو بومەلەرزانەی تێکەڵمان دەکاتەوە و گەندەڵی دەیقۆزێتەوە، دەمێنێ. لەو کاتانەشدا زەبردان لە نیزامی دیموکراسی کارێکی ئاسانە. ئەو ئەمرە سەلمێندراوەش هەیە کورد ناتوانێ ببێتە دەوڵەت ئەگەر ولاَتێکی هاوولاَت نەبێت. سەیر بکەن ئەمانە گشتیان پێکدی ناکۆکن، بەلاَم چارەنووسی کورد وایە دەبێ بۆ سەربەخۆیی بە رێگایەکی ئاوها ناکۆکدا تێپەرێت.

ئەم قسانە بۆ پاساوهێنانەوە نالێم، بەڵکو دەمەوێ سەرنجی سەرۆکایەتی و حکوومەتی کوردستان و خەڵکیش بۆ ئەوە رابکێشم کەوا ئێستا بووەتە پێویستییەکی بەوەج و دەبێ میکانیزمێك بۆ کەمکردنەوەی ئەو بەلاَیانە ( گەندەڵی و ناشەفافیەت) بدۆزرێتەوە. هەروەها دەبێ ئاگاداربین هەندێکجار بەرژەوەندی بالاَی نیشتمان بۆ بەرژەوەندی شەخسی دەقۆزرێتەوەو بەد تەفسیر دەکرێ. ئەوە نیزامی کۆمەلاَیەتییە کە نیزامی سیاسی لەسەر دروست دەکرێ. ئەگەر هەردووکیان چەسپاو نەبوون، بوار بۆ دەربڕینی راستیەکان نامێنێ. ئەو گۆرانیەی کە دەڵێ (هەر من دەزانم کوێم دێشێ بەو داخەوە رۆژێك دەمرم) لەوانەیە هەر بۆ دڵداری نەگووترابێ. بۆ نموونە ئەو تەنگوچەلەمانەی لە نێوان حکوومەتی کوردستان و حکوومەتی عێڕاق دروست دەبن، ئەگەر هۆکار و کاربەدەستەکانی ئاشکرا بکەین، هەر سبەینێ تەنگوچەلەمەیەکی گەورەی سیاسی ناوخۆ دروست دەبێ. کەوابوو من ناتوانم بیلێم، کەواتە شەفاف نابم، جا بۆیە نیزامی دیموکراسی کەموکوری تێدا دەمێنێ. وێدەچێ تا ماوەیەکی زۆریش ئەوە چارەنووسمان بێت.



وەك ئاماژەم کرد ئەو کەلێنە بەرینە لەنێوان کادری بەرێوەبەری کارگێڕی و خەڵکدا هەیە. بەشی هەرەزۆری بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە ئاماژەم بە هۆکارەکانی کرد. بەشێکی دیکەشی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە تا نەبینە دەوڵەت سەرچاوەکانی و زەمان ناکەوێتە بەردەست و گرفتی بێ وزەییمان پێچارەسەر ناکرێت. بەداخەوە تا ئەم دواییە حکوومەتەکەمان رانەهاتبوو راستیەکان بە خەڵك بڵێت. بۆ نموونە کێشەی سوتەمەنی دیارە کە سەرچاوەکانی لە دەستی کوردستاندا نین. دەبوا لە رۆژی یەکەمەوە ئەم مەترسییە بە میللەت بگووترێ کەوا عێڕاق و ئەمریکا نایەڵن بە خێرایی نەوت دەربێنین و ئەو سوتەمەنییەی عێڕاقیش هەیەتی نایەلێ بگاتە کوردستان. کاتێکی سوتەمەنی نەما و خەڵك سەرما و گەرمای بوو، هاتووچۆ گران دەبێ، پارە قیمەتی نامێنێ. ئەوانە هەموویان بەلاَی ئەوتۆن کە لەو مەسیرەی من باسمکرد، بەسەر هەر کەسێکدا بێت ئەوە تورە و بێزار دەبێ. بەلاَم ئەگەر حەقیقەتەکەی بخەیتەبەردەم، بێزارییەکەی بێزاری ناوخۆیی دەبێ نەك بێزارەیەك ببێتە هەوڵ بۆ رووخاندنی حکوومەتەکەی.

لەم دواییە حکوومەت ملی لەبەرناوە راستیەکان بەخەڵك بڵێت. دووەمین بەشی وزە، کارەبایە. کاتێك حکوومەتی داگیرکار رۆیشت هیچی بۆ بەجێنەهێشتین. بەم حاڵەی ئێستا، حکوومەتی کوردستان ناتوانێ سوتەمەنی و کارەبا دابین بکات و هیچ حکوومەتێکی دیکەش لەم حاڵەدا ناتوانێ بیکات. ئەگەر پۆل بریمەریش بکرێتە سەرۆکی حکوومەتی کوردستان، نە ئێستا و تا پێنج ساڵی دیکەش ئەم دووانەی پێدابین ناکرێن. تەنیا یەك رێگ هەیە ئەویش دەبێ کەرکوك و ناوچەکانی دیکە بگەرێنەوە سەر کوردستان جا ئەو کاتە لێمانگەرێن پالاَوگای گەورە دامەزرێنین تا نەوت جاری یەکەم بۆ پێویستی ناوخۆ دابین بکات. ئەگەر سوتەمەنی هەبێ ئەوجا دابینکردنی ئیستگای کارەبا وەك سوپەر مارکێتەکانی مازی و نیوسیتی ئاسان دەبێت. هاوکێشەکان زۆر سادەنە بەلاَم بەداخەوە حکوومەت زۆر درەنگ ئەوانەی بەخەڵك گوتوون. ئەوانە هەموویان دەیسەلمێنن تا سەربەخۆ نەبین و لە عیراق جیا نەبینەوە ئەوە حاڵمان دەبێ.

نەوەد ساڵە لەگەڵ عێراق لە شەڕداین، لە ساڵی ١٩٧٠ وە بۆ ماوەی سی ساڵ قۆناغی رەشترین مومارەسەی دیکتاتۆری و رژێمێکی شۆڤینی داگیرکار لە کوردستان

بووه. دوای ئەوە تەجرەبەی خۆشمان هەیە کە لە ساڵ١٩٩١وە دەسپێدەکات. هەموو ئەوانە کۆمەڵێك نەرێتی پێکهاتەی کەسایەتی و پێکهاتەی حزبەکان و ڕێکخراوەکان و جۆری حکوومەت بەرێوەبردنیان دروست کردووە. ئەوانە شکڵ و شێوازی نیزامی سیاسی کوردستانیان داڕشتووە. ئەوانە نیشانمان دەدەن کۆمەڵگاکەمان تووشی زۆر نەخۆشی بووە. نەخۆشی بەڵام بەکام مانا؟ کاتێك حزب لە پێویستییەکی سیاسییەوە ببێتە بنەمای مەحسوبیەت بۆ کاری ئیداری، وای لێهاتووە ببێتە بنەما تا لە گەرەکێکدا ڕێز لە کەسایەتیت بگرن، تاك تاکی خەڵکی ئەم وڵاتە چاوی لێیە لە ڕێگای حزب و ڕێکخراوەکانیەوە معاش وەربگرێ. نەفەرێکت دەستناکەوێت کەوا تەمای کارخانەیەکی بچووکی هەبێ و بەرهەمبێنێ. یەك ئەندازیارت دەستناکەوێ خاوەنی ڕوانگایەکی لەبار بێت بۆ جوانکردنی شارێکی گەورەی وەك هەولێر کەوا بە خێرایی پەرەدەستێنێ. وڵاتێك ئەم هەموو تەنگژەی هەبێت کەچی کرێکار لە هندستان و فیلیپینەوە دینێ و هاووڵاتیانی خۆی کار ناکەن. ئەوانە نیشانەی نەخۆشێتی میللەتن. کەسانێکی زۆری تێدایە بەشەرتێك لەکاتی هەڵبژاردنەکان دەنگ دەدات کە پارەی بدرێتێ! ئەگەر عزیز نەسین مابایە دەیگووت سیفەتی سەگیان وەرگرتووە، کاتێك پێتناوەڕن کە نانی بدەیتێ. ئەمەش جۆرێکە لە نەخۆشی گەندەڵی. ئەم نەخۆشییە هەموومان دەگرێتەوە بە منیشەوە، تا هەموو گەڕەك و گوندەکان. بێ شەهامەتترین (بێتەحداترین — خۆرانەگرترین) گوندیمان هەنە چەند جار دەیانگێرنەوە شوێنەکانیان کەچی دێنەوە ناو شار و ئامادە نینە بچوکترین منافەسە لەگەڵ بەرهەمەکانی دەرەوە بکەن. لە ڕوانگای من، گوندی ئەو جوتیارەیە کە کشتوکاڵ بەجێدێڵێ و دێت لە پەراوێزی شارەکان دەژیت. لەم حاڵەتەیدا پێوەری جوتیارێتی لەسەر بەکار نایەت، بەڵکو دەبێتە کەسێکی پەراوێزی شارەکان کە بە فەرهەنگی گوندییان دەیەوێ لە شار بژیت. ئەوانە گرفتی شارەکان زیاتر دەکەن و زیانیش لە بەرهەمی جوتیاران دەدەن. بۆ نموونە من چوومە گوندێکی بەرواری باڵا تەنیا چەند پیرەمێردێکی لێبوو. گووتیان ئێمەش بۆ یادگاری دێینەوە ئێرەو گەنجەکان هەموو بوونەتە پۆلیس و ئاسایش یان لە ڕێکخراوەکاندا کار دەکەن. هەموویان لە شارەکانن.



با ئاوڕێك لە بواری گەنجان بدەینەوە. کام گەنج لە نەخوێندەوار تا زانکۆ هەیە بڵێ ئەوە پرۆژەی منە بۆ کارکردنم لەم بوارانەی وا پێشنیارم کردوون؟ وەڵڵا نە دیتوتانەو نە گوێتان لێی بووە. تەنیا داوا دەکەن ئەگەر بکرێ نامەیەکم بۆ بنووسی بۆ فلان وەزیر و گزیری بەڵکو معاشێکم بۆ ببڕێتەوە. لەم وڵاتەدا کەسی وا زۆرن نزیك دە معاشیان هەیە و ئەگەر کۆی بکەیتەوە لە معاشی وەزیرێك کەمتر نییە ئینجا هەر نارازیە و باسی گەندەڵی دەکات! ئەم قسەیەم بەنموونەیەك وەربگرن لەناو میللەتێکی نەخۆشدا کە میللەتی شێواوی دوای شەڕی پێدەڵێن. سەرنج بدەنە ئەم سیفەتانە کە هەموویان نەخۆشین: گومانکردن، پیلانگێران، باوەڕنەکردن، ئەوانە سیفەتە گشتییەکانی کۆمەڵگای ئێمەنە. جا لەم کەشەدا چۆن بە ئاسانی دەتوانی کەلتوری شەفافیەت و دیموکڕاسی و قەڵاچۆکردنی گەندەڵی بچەسپێنی؟

پرسیار دەکەم ئایا لە وڵاتی ئێمەدا سەرمایەدار هەیە؟ ئەگەر هەبایە دوو جوامێر لەبەرامبەر سەرۆکی حکوومەت نێچیرڤان بارزانی وەڵامیان دەبوو، کاتێك بازاری نێودەوڵەتی هەولێری کردەوەو گووتی ئەم بازارە گەورەمان بەهاوکاری سەرمایەدارەکانی دەرەوە دروست کردووە و خۆزیا سەرمایەدارانی ناوخۆشمان بەشدارییان کردبا. ئەگەر بەرهەمهێنەر هەبان یەکێك دەیگووت ئەزبەنی من هەبووم بەڵام لەبەر بەلاوەنان و گەندەڵی ڕێگایان نەداین.

لەم وڵاتە پارەدار هەن بەڵام سەرمایەدار نین. سەرمایەدار دەزانێ چۆن سەرمایە بەگەڕبێخێ و ڕانەوەستێ. یەکێك لە قسەکانی دەوڵەمەندە کۆنەکانی کوردەواری ( کە ئێستا نەماون) ئەوەیە پارە وەك ئاو وایە کە بەریگیرا بۆگەن دەبێ. لەلایەکی دیکە بازرگانی جیهانی لەسەر بنەمای سیستەمی بانکداری بەرێوەدەچێ. پەرلەمانی کوردستان دەبێ جورئەت وەبەر کۆمەڵگا بێنێ و یەکێتی مامۆستایانی ئاینی کۆبکاتەوەو پێیان بڵێ یاڵا فتوا بدەن نیزامی بانکی حەڵاڵە و حەرام نییە. چاکسازی ئاینی لەم بوارانەدایە نەك لایەنە بڕوایی و عیبادییەکان. پێویستە سودی بانکی هەر ناوێکی لێبنێی حەڵاڵ بکرێ. تا ئەم قۆناغە تەجرەبە نەکەین و سەرمایە نەك لە زاخۆ تا خانەقین بەڵکو بە یەك دوگمەی کۆمپیوتەر لە هەولێرەوە نەگاتە چین و ئەمریکا، سود و قازانجەکەی بۆ ئێرە و ئەوێ،





شەرعی نەبێ، وڵات پێشناکەوێ. پارەدارەکانی ئێمە زۆربەیان سەرەك جاش و هاوکارەکانی حکوومەتی پێشوو بوون، ئەویش تا بەم چەشنە ڕەفتار بکات، جوامێری وەك پێشمەرگە فێر دەبێ پارە کۆبکاتەوە و عافێتیشی بێت. ئا ئەوهایە گەندەڵی بەردەوام دەبێت. ئێمە پێویستە گرفت و کێشەکانمان ئاشکرا بکەین تا بتوانین چارەسەریان بدۆزینەوە. لە بیرمە لە کاتی ئاوارەییمان تا دایکم نەخۆش دەبوو من دەمبردە لای دکتۆر، پێیدەگوتم: کوڕم پێیبڵێ ئێرەم و ئێرەم دێشێ. ڕۆژێك دکتۆرێك قسەی پێبڕیم و گووتی: دەلێگەڕێ با بۆخۆی نەخۆشیەکانی بڵێ خۆ زمانی پێوەیە.

ئێمەش دەبێ زمانمان بکەینەوە و ئێش و ئازارەکانمان بڵێین، ئەو قارە قارەی دەکرێ و دەڵێ: تۆ سوڵتەی و من سوڵتە نیم، تەنیا قسەی قۆڕی ئەنارشیستانەیە و دەوڵەتی پێدروست ناکرێ.( چونکە دانیشتنەکە بۆ لێکۆڵینەوەیە هەرکەسێك حەزی لە قسەی من نییە دەتوانێ دەربچێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە مەمنونم) تا معاشدان بە خەڵك لە مقابیل کارنەکردندا بەردەوام بێت و حکوومەت لە پارە بەخشینەوە بەردەوام بێت (دەڵێن ٧٢٪ی بوجەی حکوومەت بۆ معاشەکان دەڕوات) ئەوە لەبارترین زەمینەیە بۆ بڵاوبوونەوەی گەندەڵی. جا ئەگەر بەجدی چارەسەر نەکرێ و تەجرەبە ساغەکەی دەرەوەی بۆ نەهێندرێ، نە گەندەڵی بە ئاسانی کۆتایی دێت نە کەم دەبێتەوە، نە شەفافیەتیش لە کۆمەڵگایەکی تەقلیدیدا کارێکی ئاسان دەبێت.

خۆ ئەگەر ئەو پارە زۆرەی نەوتمان بۆ بگەڕێتەوە، لەم بەڵایانە زیاد دەکات و کەمتری ناکاتەوە. مەترسییەکە ئەوەیە دوور نییە بمانبات بەرەو شێوازی کۆمەڵگای خەلیجی. وەك کۆمەڵگای کوێتی و سعودیی. لەوێ خەڵك چاوی لێیە خزمەت بکرێ و بۆ کاری ناومالێش لە دەرەوەڕا خزمەتکاریان بۆ بێنن.

من هەوڵمدا هەندێك لە گرفتەکان باس بکەم بەڵام دۆزینەوەی چارەسەر ماندوبوونێکی زۆری دەوێ و کاری خەڵکی دیکەیە. ئەگەر لە قسەکانمدا هەستی کەسم بریندار کردبێ داوای لێبوردنتان لێدەکەم. تەجرەبەی من وەك پێشمەرگەیەك کە تا ئێستا بەردەوام بوومە و لە لایەنی دەسەڵاتیشدام، پێویستە قسەکانم فەرقی هەبێ لەگەڵ ئەو کەسانەی لە قەراغ و لە موعارەزەدا دەکرێن. من لایەنگری ئەم حکوومەتەم و بەشێکم



لەو، بەڵام دەزانم کەموکوڕییەکان لە حکوومەتدا هەیە و زۆربەیان کۆمەڵایەتی و کەلتورین. من نەهاتووم راچێتیکی پڕ لە چارەسەری باس بکەم، قسەکانیشم قسەی دیکەی کێشاو ئێوەش سوپاستان دەکەم کە گوێتان بۆ گرتم و مناقەشەتان کردم، بۆیە بیست دەقیقە زیاتر قسەم کرد منیش بیست جار داوای لێبوردنتان لێدەکەم.

ئێمە نەوەیەکین باسی کێشە هەرە حەساسەکانی ئەم وڵاتە دەکەین، زۆر لەوانەی لێرەن لە کارەساتەکاندا بەشدار بوون و هەندێکمان لە مقاوەمەتەکانیشدا بەشدار بووین. با کەمێك زیاتر مناقەشەی پرسیارەکانی دانیشتوان بکەم. من گووتم شەفافیەت بریتیە لەو میکانیزمەی کەوا لە وڵاتانی پەرەسەندووی هاووڵاتی خاوەن تەجرەبە، لە کەلتورێکدا کە دیموکراسی تێدا شۆڕ بۆتەوە، ئەو میکانیزمە پەنجەرەیەکی ڕووناك لە نێوان ژیانی شەخسی و ئابووری و سیاسی دەکاتەوە. ئەمە پێیدەگوترێ شەفافیەت. لە کەلتوری ئێمەدا شەفافیەت لەرووی دینییەوە نەك هەر حەرامە بەڵکو لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە ناپەسندە. کام لە ئێوە ئامادەن بیرەوەریەکانتان بەراستی بنووسن، نەك بەخۆتاندا هەڵبڵێن؟ کێ لە ئێمە قبوڵ دەکات عەیبەکانی بگووترێن؟ لە کۆمەڵگای داخراودا هەموو شتێك عەیبە. لە کۆمەڵگای دینی پیرۆزیی هەیە، هەر لەوەڕا پیرۆزیی سیاسی و کۆمەڵایەتش هەیە. لە کۆمەڵگای کراوەی شارستانیدا هەموو ئەو عەیبە و پیرۆزییانە تەفروتونا کران، هەر ئەوەشە ڕێگادەدات سەرکۆمار بێنن لە ژیانی شەخسی خۆی بدوێت ( نموونەی کلنتۆن و مۆنیکا) بەڵام پێی سوك نابێ، لە پلەکەشی نەهاتە خوارێ. لە وڵاتی ئێمەدا کەس ڕێگا دەدا لێی پرسن چۆن ژنت هێنا؟ جا ئێمە کە دانیشتووین و باسی خۆمان دەکەین دەبێ دان بەوەدا بنێین  کە گرفتمان هەیە. بە سەدان دانیشتنی ئاوها و لێکۆڵینەوە پێویستە تا هەنگاوێك بەرەو چارەسەریی نیهایی دەهاوێین. ئەگەر وابیرنەکەنەوە هەڵە دەکەن. پرۆسەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بەو ڕێگایەدا دەڕوات. یەکێك لە جوانیەکانی گفتوگۆ ئەوەیە کە رای یەکدی کەشف دەکەین. خۆ ئەگەر بە یەك گفتوگۆ گرفتەکان چارەسەر کرابان، ئێستا دنیا بەهەشتی بەرین دەبوو. کەچی دەیان گفتوگۆ دەکرێ تا ماددەیەکی قانونی یان حوکمێك بۆ فلان مەجال دادەڕێژرێ، دوایی چەند ساڵ دەبینی کۆمەڵێك کەموکاسی لێ دیاردەکەوێ.

لەکۆتایی دا دەڵێم گەندەڵی بریتییە لە کەڵك وەرگرتنی بەد لە دەسەڵاتی سیاسی و لە پلەی ئیداری بۆ سێ ئامانج: ١- بۆ پلەی سیاسی ٢- بۆ پلەی کارگێڕیی ٣- بۆ دزینی سەرمایەی میللی و رەپێشنانی بەرژەوەندی شەخسی. گوتیشم ئەوە جۆرێکە لە لادان.

* ئەم نووسینە دەقی ئەو کۆڕەیە کەوا لە ٢٠٠٧/٢/١٥ لەسەرخواستی رێکخراوی هاریکاری و گەشەپێدانی دیموکراسی، لە هەولێر پێشکەشم کرد. دیراسەکەی من بۆ ژمارەیەکی کەم نووسەرو مامۆستای زانکۆ و پەرلەمانتار بوو. بە هیچ شێوەیەك بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن نەبوو هەر بۆیەش لە قسەکردندا وەك هەر دیراسەیەك بەلامەوە مەبەست گرنگ بوو نەك دیققەت لەسەر وشەکان. بەداخەوە موخالیفە سیاسییەکانی من دوور لە نەریتی سمینار و رۆژنامەگەری، چەند وشەیەکیان لە یەك سەعات و نیوی تێکرای قسەکانی من بە شێواوی و بۆ مەبەستی سیاسی، بەدزی تۆمار کردبوو بەبێ ئیجازەی من کردیانە ماددەی هاندانی رای گشتی لە دژی پارتی دیموکراتی کوردستان و شەخسی من. بۆیە بەباشمزانی بە پێچەوانەی حەزی پێشوی خۆم و لەبەر گرنگی بابەتەکە بڵاوی بکەمەوە تا هاوولاتیان بزانن من چیم گوتووە.

هەڵبەت لەرووی زمانەوانییەوە رێکمخستۆتەوە چونکە قسەی ئیرتجالی دووبارەبوونەوەو بێ دیقەتی تێدەکەوێ. بە تایبەتی لە هێنانەوەی نموونەیەك بە عەزیز نەسین و بەکارهێنانی سیفەتی سەگ بۆ کاری گەندەڵی وشەی (شەهامەت کە لای من بە مانای تەحەدا و بەرەنگاربوونەوە بەکارهاتووە) و بۆ هەندێك کەسم بەکارهێناون نەك بۆ هەموو میللەت، غەدرێکی زۆریان بەمل دابڕیم کە من لێی بێ بەریم و لەوەوپێشیش بۆ ئەم شێواندنکارییە ئەگەر لێم حاڵی نەبووبن داوای لێبوردنم کرد.



## بەشی سێیەم:

### - ئازادیی بیروڕا جورئەت و پشتیوانی دەوێ:
### - گفتوگۆ لەگەڵ خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی:

بە گەرمی بەخێرهاتنی ئەو خوێندکارە بەرێزانە دەکەم کە لە کۆلێژە جیاجیاکانی زانکۆی سلێمانییەوە هاتوون تاکو لێرە گفتوگۆ بکەین. من شانازی بەوەوە دەکەم ئەو کەسانەی لە بیروڕادا لە من جیاوازن، بێن رووبەڕوو وەك نووسەرێك پێم بڵێن: تۆ هەڵەیت، دوایی پرسیار و وەڵامان لەنێواندا بێت.

لەلایەکی دیکەشەوە سەمینارەکەی پێشووی من کە بڵاویش کرایەوە، بووە مایەی گفتوگۆیەکی گەرم کەوا پەیوەندی بە چارەنووسی نیشتمانەکەمان هەیە و ئێستاش بۆ بەردەوامی هەمان بابەت لێرە کۆبووینەتەوە. ئەوەیە من شانازی پێوەدەکەم. هاتنی خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی نیشانەی هەبوونی زیندوویەتییە لە ناوەندە زانکۆییەکاندا، هەر بەم بۆنەوە رەخنەی خۆم بەرامبەر بە کەشوهەوای ناو زانکۆی سەلاحەدین ( کە زۆر جار بۆ خۆشی ناویان دەهێنم) راستدەکەمەوە. گومانی تێدا نییە ئەو قسانەی ئێمە لە گفتوگۆکانمان دەیانکەین هیچیان متلەق نین و حەقیقەت بە تەنیا لەلای کەسێك، لایەنێك، حزبێك، دینێك، نەتەوەیەك یان پێکهاتەیەکی ئەم وڵاتە نییە. هەروەها حەقیقەت بە تەنیا لەلای حکوومەتیش نییە بەڵام گومانی تێدا نییە هەموو حەقیقەت لەلای هەموان کۆبووەتەوە.

هەڵبەت من نامەوێ ئەو قسانەی لە سمیناری پێشوومدا کردبووم، دووبارەیان بکەمەوە. خۆزیا کات و دووری رێگا نەبووبانە ئاستەنگ تا توانیبام لەگەڵ تاك تاکی ئێوە بە تێری گفتوگۆ بکەم بۆ ئەوەی پێش هاوڕاییمان لەسەر جیاوازییەکانمان





قسەبکەین و باشتر لە یەکدی حاڵی ببین. با نموونەیەکی جوان لە زانکۆی تاران بێنمەوە، ئەوان لە بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی ئەوێ دا زیندووترین ناوەندی سیاسین.

ئەو نارەزاییەی بەرامبەر بە سەمینارەکەی من لە ناو زانکۆی سلێمانی کرا، بە ڕێزەوە تەماشای دەکەم و گوێی بۆ دەگرم. ئەو ڕێز و خۆشەویستییەشم لەو کەسەوە دەستپێدەکەم کە بڵندگۆیەکەی پێبوو کە لەوانەیە سمینارەکەی منیشی بە تەواوەتی نەبیستبووبێ، بەڵام خەڵکی شەقامەکانی هاندەدا تاکو ئیمزا بدەن و سەرۆ قادر بدرێ بە دادگا. هیوادارم ئەو تەجرەبەیە فێرمان بکات باشتر گفتوگۆ بکەین. چونکە لە زانکۆکانی کوردستانەوە رۆشنبیر و تکنۆکرات و دەوڵەتمەدارەکانی دوارۆژی ئەم میللەتەی لێدروست دەبن، هەروەها ئەو حکوومەتەی هەمانە و شانازی پێوەدەکەین و دەمانەوێ چاکسازی تێدا بکەین، پێویستە بەشی هەرەزۆری ئێوە پێیهەڵسن کە بەرێوەبەر و سەرۆکەکانی داهاتووی وڵاتن. بۆیە ئەم رۆڵەتان وا دەخوازێ بە سنگی فراوانەوە رای یەکدی قبوڵ بکەن و گوێ لە یەکدی بگرن. جا ئەگەر لە جۆر و شێوازی گفتوگۆیەکاندا کەموکوڕی هەبوو دەبێ بەبیر یەکدی بێنینەوە.

سمیناری پێشووی من بۆ لێکۆڵینەوەیەکی داخراو بوو، بووە هۆی گفتوگۆیەکی توند، نایشارمەوە راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان پشتیوانی باشییەکانی دروستبوونی ئەو گفتوگۆیەیە. لە هەمانکاتدا ئەو دەزگا راگەیاندنانەی بە راستەخۆ و ناراستەخۆ کاریگەریمان بەسەریانەوە هەیە، هەوڵیاندا بە شێوەیەکی ئیجابی هاوکاری بەرێوەچوونی گفتوگۆیەکان بکەن، بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ ئەنارشیزم (فەوزا) تێکەڵ نەبێ.

لە نیزامی دیموکراسیدا، ئەنارشیزم وەك دیاردەیەك بواری سەرهەڵدانی هەیە بەڵام ئەم دیاردەیە بەشێك لە پێکهاتەی دیموکراسی نییە. لە دیموکراسیدا ئەم دیاردەیە کۆنترۆڵ دەکرێت ئەوجا دوایی چارەسەری بۆ دەدۆزرێتەوە. هەر وەك چۆن نەخۆشی دەروونی لە نەخۆشخانە وەردەگیرێ و تیمار دەکرێت، دوایی وەك مرۆڤێکی ساغ دەنێردرێتەوە ناو کۆمەڵگا. لێرەدا مەبەستم نییە بڵێم هەرچی نارازییە نەخۆشە بەڵام



نیشاندانی نارەزایی بەرامبەر فکر یان نووسین یان حکوومەت یان حزبێك، بەرامبەر بە کەسێك کە لەوانەیە مەلایەك یان سەرەك خێڵێك یان ئینسانێکی ئاسایی بێت، پێویستە لە چوارچێوەی یاسادا بێت و نەگاتە سنووری هەرەشەکردن. ئەگەر هەرەشە کرا پێویستە بزانن لەگەڵ سڕینەوە تێکەڵ دەکرێ. لە رۆژهەڵاتی ناوەراست و لەوێش لە عێراقدا دەبینین سڕینەوە چ مانایەکی هەیە و لە عێراقیشدا کە بەداخەوە تا ئێستا بەشێکین لەو دەوڵەتە، چۆن رەفتاری پێدەکرێ! سڕینەوە لە کەلتوری عێراقدا تەقاندنەوەو کوشتنی تێدایە. ئەو چەشنانەی ئاماژەم پێکردن لە جۆرە هەرە تۆقێنەر و ترسێنەرەکانن. بەشێکی زۆری ئەوەی لە ئەنجامی سمینارەکەی من بیستمان و دیتمان، لە جوغزی گفتوگۆ دەرچوون و تێکەڵکرا لەگەڵ رەفتاری پاکستانییەکان بەرامبەر بە سەلمان روشدی، رەفتاری بەنگلادیشییەکان بەرامبەر نووسینێکی تەسلیمە نەسرین، وەك ئەو هەرایە بوو کە باشووریەکانی لوبنان دەیکەن. کەچی ئەوانە هیچیان لە کەلتوری ئێمەدا نین، لە وڵاتی ئێمەدا هیچ ئامانجێکیشیان پێناهێندرێتەدی. ئەوەی دیتمان دووبارەکردنەوەی ئەو رەفتارە سیاسییە ئایدیۆلۆژییە بوو کە لە بازاڕەکانی هەولێر و سلێمانی تێزابیان بە قاچی ئافرەتەکاندا دەکرد تاکو جلی هاوچەرخ لەبەر نەکەن! ئێمە لە زانکۆکانەوە دەنگێك دەبیستین کە داوا دەکات کۆمەڵگا بەرەو شارستانیی بروات و ئازادییەکانی تاك بپارێزرێن. پرسیار ئەوەیە: لایەنێك یان کەسێك تەحەمولی ئازادی بیروباوەر نەکات، چۆن ئازادییەکانی دیکە قبوڵ دەکات؟ دیارە هەموو ئازادییەکانی دیکە لە ئازادی بیروباوەڕەوە (عەقیدە) دەست پێدەکەن، واتە لە دینەوە تا دەگاتە گفتوگۆمان لەسەر جۆری جل و بەرگ. ئەوەی دواییان سادەترین جۆری ئاماژەکەی منە لەوانەیە لەنێوان دوو کەس رووبدات. ئازادی بیروباوەڕ رۆڵی سەرچاوەی ئازادییەکانی دیکە دەگێڕێ.

ناوەرۆکی سمینارەکەی من کە لە هەموو جۆرەکانی راگەیاندندا بڵاوکرایەوەو گرفتی لەسەر دروست بوو (بە نووسینیشەوە)، وشە بە وشە لێی بەرپرسم و خۆم بە خاوەنی دەزانم و ئامادەم لەگەڵ هەر کەسێك یان ناوەندێك یان رادیۆ و تەلەفزیۆنێك





بە بەڵگە و روونکردنەوەی زیاتریش دووبارەی بکەمەوە. جێگای بایەخی من گرفتەکانی حکوومەتێکە بەرهەمی سەد ساڵ تێکۆشانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانە. ئەم حکوومەتە بەرهەمی خوێنی ئەو شەهیدانەیە چ ئەنفال کرابن یان لە ناو سەنگەردا خۆیان فیداکردبێ، سەدان هەزار هاووڵاتی دیکەمان بزرن و نازانین چیان بەسەر هاتووەو لە کوێن؟ ئەرێ شەهید بوون یان لە تاراوگەدا بزر بوون؟ هیچ ئامارێکی دەقیقمان لەبەردەستدا نییە بزانین چەندان هەزار هاووڵاتیمان لە ئاوارەیی و تاراوگەدا هۆشی خۆیان لە دەستداوەو بە دەست نەخۆشیە دەروونیەکانەوە دەتلێنەوە، ژمارەیەکی زۆریش تێکەڵی کەلتوری بیانی بوون و لە دەستمان چوون. ئەوانە هەموویان قوربانییەکانی وڵاتەکەمانن. ئەو حکوومەتەی هەمانە بەرهەمی هەموو ئەوانەیە. جیا لەوە ئێمە وڵاتێکین بچووکترین تەجرەبەمان لەخۆبەڕێوەبردندا نییە و تەماشمان وایە هاووڵات بین. تەجرەبەشمان لە دیموکراسیدا نەبووە.

دیموکراسی بە قسەکردن و کتێب خوێندنەوەی تەنیا، نەقڵ ناکرێ بەڵکو بەپێی تەجرەبەی جیهانی دیموکرات، کاری نەوە دوای نەوەیە. ئەو نەوانە زۆر قۆناغ پێکەوە تاقی دەکەنەوە تا جۆری مناسبی دیموکراسی بۆ وڵاتەکەیان دەدۆزنەوە و لەسەری رێکدەکەون. بۆ نموونە یاساناسەکان دەزانن کاتێك دەستور و یاساکانی دیکە دادەرێژرێ، دەبێ بە وریاییەوە تایبەتمەندییەکانی کەلتوری و ئابوری و پێکهاتەی وڵاتەکەیان لەبەرچاو بێت تا ئەو کۆمەڵگایە بڕوای بە یاساکان بێت و پەیرەویان لێبکات. ئێمە گرفتێکی دیکەشمان هەیە، ئەویش تەنیا ئەوە گرنگ نییە حکوومەت یاسای باش دابنێ، بەڵکو قەناعەتپێهێنانی هاووڵاتیانیش کارێکی سەختە. دەمەوێ سەرنجتان رابکێشم کە حکوومەتی کوردستان تاکە دەسەڵاتی هەڵبژێردراوی رۆژهەڵاتی ناوەراستە کە بۆ دانانی یاسای هاوچەرخ لەپێشەوەی هاووڵاتیانیدایە، سەرباری هەموو کەموکوریەکانی. لە وڵاتانی دیکە خەڵك لە حکوومەت لە پێشەوەترن و هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەدەن تا پەرلەمان یان حکوومەت ناچار بکەن بەندێك لە یاسایەك زیاد بکات کەمێك مافی مرۆڤی تێدابێت. کەچی لێرە



حکوومەتی ئێمە دەبێ زۆر هەوڵبدات تا خەڵك رازی بکات بۆ ئەوەی یاسایەك دابندرێت لە خزمەتی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا بێت. ئەوە سەرەتایەکی باشی کاری بەرێوەبردنی حکوومەتی کوردستانە. ئەوەش بە تەنیا ناگەڕێتەوە بۆ کەسێك یان حزبێك بەڵکو تایبەتمەندییەکی میللەتی کوردستانە چونکە ئەم حکوومەتە هەڵقوڵاوی میللەتەکەمانە. پێویستە لەم رووەوە شاهیدی بۆ بدەین و ساغی بکەینەوە.

دیاردەی دیکە هەنە و دزێون، وەك گەندەڵی کە زۆرمان لەسەر باس کرد بەڵام گرنگ لەوەدایە چۆن چارەسەر دەکرێت؟ ئایا هەر لە وڵاتی ئێمەدا هەیە؟ نا. ئایا لەسەر ئەوە حکوومەتەکەمان بروخێنین کە سەد ساڵە بۆ هێنانەدی تێدەکۆشین؟ لە وڵاتانی دیکە شتی تێکدەرانەی لەم چەشنەیان کردووە؟ نا، وایان چارەسەر نەکردووە. هەڵبەت رێگای تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە هەیە و چارەسەریش دەکات.

لە سمینارەکەی مندا مامۆستایەکی زانکۆ لێی پرسیم بۆ رێگاکەمان نیشان نادەیت؟ گووتم کاکی من زانکۆی وڵاتانی دیکە بۆ ئەم مەبەستانە چەندان جار گفتوگۆ دەکەن تا دەگەنە چارەسەرێکی بچووك، ئێمە پێویستە لە گفتوگۆ ماندوو نەبین و لەکاتی هەڵچووندا نەبین بە دوژمنی یەکدی. پێویستە وەك هەموو دنیا جیاوازییەکانمان نەبن بە دوژمنایەتی. نابێ رەتکردنەوەی فکری یەکدی تێکەڵی تیرۆر بکەین. ئینجا کە دەڵێین دەبێ یاسا سەروەر بێت، هەر کەسێکی ئەم وڵاتە لە سەرۆکەوە بگرە تا دەگاتە سادەترین هاووڵاتی، لەکاتی پێشێلکرانی مافەکانی پەنا بۆ یاسا بەرێت و داوای گێرانەوەی حەقی خۆی بکات. لە هیچ وڵاتێکی دیموکراتدا نییە بەبێ پەنابردن بۆ یاسا برژێنە ناو شەقامەکان و داوا بکەن کە دەبێ فلان کەس یان فلان سەرکردە یان فلان وەزیر یان ئەندامێکی پەرلەمان بگیرێ و بدرێتە دادگا! ئەوە چاولێکەری تەجرەبەی لوبنانە کە چەند مانگە خەڵکانێك لەناو شەقامەکان دانیشتوون و داوای روخاندنی حکوومەتی هەڵبژێردراو دەکەن، بەڵام نە پەرلەمان و نە رای گشتی لوبنان و جیهان، هەروەها نە ئەوانەی لە ناوەندە ئاکادیمییەکانی دنیا فکری دیموکراسی دادەرێژن، حساب بۆ مانگرتنەکەی بەردەم سەرۆکایەتی ئەنجومەنی





وەزیرانی لوبنان ناکەن. بۆ؟ چونکە ئەوە فەوزەویەکانی لوبنانن کە لە هەڵبژاردن نەیانبردۆتەوە و ناشتوانن وەك سەرەتای سالآنی حەفتاکانی سەدەی رابردوو رەشاش و تۆپ بەکاربێنن، ناچارن مانگرتن بەکاردێنن. هەر بۆیەش کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە شێوازی هاوچەرخ مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و پێیاندەڵێن ئێوە فەوزەوین و بگەڕێنەوە ماڵەکانی خۆتان و تەحەمول بکەن تا هەڵبژاردنی داهاتووی لوبنان دێت و لەسەر سندوقی دەنگدان دوابڕیاری خۆتان بدەن.

دیموکراسی ئاوهایە و نیزامێکی جیهانییە و فێڵی تێدا ناکرێت. دنیا زۆر توند پێکەوە بەستراوەتەوە و تەجرەبەی هەر وڵاتێك کەموکوڕی تێدابێت کار لەسەر وڵاتانی دیکە دەکات. ئێمە لە کوردستان کە تازە دەبینە حکوومەتێکی نیمچە سەربەخۆ، ئەمریکاو ئەوروپا زۆر هاوکاریمان دەکەن تا نیزامە دیموکراتەکەمان رێکوپێك بێت. بۆ؟ وەڵامەکە زۆر روون و گرنگە: دارِشتنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراستی نوێ و دوایش لەوانەیە بە شێوەی گشتی ئاسیا گۆرانکاری تێدا بکرێ. خۆشبەختانە ئەو کردەوەیە لە ئێمەوە دەستپێدەکات. هەروەك چۆن مەبدەئی دەستێوەردانی ئینسانی بۆ پاراستنی گەلان، بە گەلەکەمان دوای راپەرین و کۆڕەوە گەورەکەمان دەستی پێکرد.

زۆر ناخۆش بوو کە یەك سەدە خەباتمان کرد تا سەربەخۆییمان بەدەستهێنا، بەڵام لە کۆتایی ئەو سەدەیەدا تەجرەبە ئینسانییە مەزنەکە بە ناوی ئێمەوە دەستی پێکرد. ئەویان شانسێکی گەورە بوو. دوای ساڵی ١٩٩١ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە هانای گەلانی بالکانەوە چوو، دواییش بەهانای گەلانی لێقەوماوی ئەفریقا و باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیاوە هات. ئەو تەجرەبە ئینسانییە جیهانییە لە کۆڕەوە گەورەکەی کوردستانەوە دەستی پێکرد. پێداگری میللەتی کورد لەو کۆڕەوەدا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ناچار کرد هەموو یاساکانیان لە بواری سەروەری وڵاتان بەلاوە بنێن و رەوتێکی نوێ بگرنەبەر. هەموو یاسا نێودەوڵەتییەکان لەدوای واقیعە سەپێندراوەکان دێنە وجود و دەبنە بنەمای دیموکراسی.



با نموونەی ئیسرائیل بێنمەوە کە لە ساڵی ١٩٤٨وە دروست بووەو دانی پێدانراوە بەڵام تا ئێستا نەیتوانی بیسەلمێنێ وڵاتێکی دیموکراتی هێمنە، بەپێچەوانەوە وڵاتێکی خاوەن نیزامێکی دینییە کە دەبابە لە بەرامبەر بەردی منداڵێکی فەلەستینی بەکاردێنێت، بۆیەش نەیتوانی نموونەیەکی جوانی رۆژهەڵاتی ناوەراست بێت و ببێتە جێگای تەماحی کۆمپانیا گەورەکانی ئابووری و ناوچەیەکی لەبار بێت بۆ بازرگانی لە ئاسیا. کەچی بە کوردستان دەڵێن سەرەتایەکی باشی تێدایە تا نیزامێکی دیموکراسی لێدروست بکرێ و پێکهاتەکانی جیاوازن، توندرۆ نین، رێزی دین دەگرن بەڵام حکوومەتی دینییان ناوێ، دیموکراتن بەڵام سوکایەتی بە دین ناکەن، لە چەند میللەت پێکهاتوون و یەکدی قبوڵ دەکەن، لە چەند زمان پێکهاتوون و حەقی یەکدی دەدەن، مخالیفی یەکدین و یەکتر قبوڵ دەکەن، گفتوگۆ دەکەن و لە دەموچاوی یەکتر نادەن، بۆیە دەتوانن نموونەیەکی شیاو بن بۆ رۆژهەڵاتی ناوەراستی بچووك، ئەوجا گەورە، دوایی ئاسیا و بەشێك لە ئەفریقاش.

ئێستا کە من ئەم قسانە دەکەم لەوانەیە هەندێك کەس بە سادە یان فشە وەریبگرێ، بەڵام دوای چەند ساڵی دیکە ئەنجامەکانی دەبینین. ئەوە سەرباری هەبوونی ئەو کەموکوریانەی دەیانزانین. ئەو کەموکوریانە تەنیا لەلای حکوومەتەوەیە؟ پێشدانیش گوتوومانە حکوومەت کەموکوڕی هەیە و هەموو کەس دەیبینێ. لێرەدا بەباشی دەزانم بگەڕێمەوە بۆ قسەکانی بەرێز نێچیرڤان بارزانی لە پەیامی پیرۆزبایی نەورۆزی ئەمساڵیدا. وەك دیارە نەورۆز جەژنێکی دینی نییە، نە جەژنێکی سیاسییە و نە یادی حزبێکیشە، بەڵکو لە ئەنجامی بەردەوامیی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان هاتۆتەدی کە ئەم حکوومەتە بەرهەمەکەیەتی، جەژنێکی نەتەوەییە و بەم مانایە بوو پەیامەکەی خۆی لەوێدا نارد:( ژمارەیەکی زۆریش هەن کە بێکارن و لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نین بەدوای کاردا بگەڕێن. ئەمە زەنگێکی مەترسیدارە. ئێمە دەزانین حکوومەت بەرپرسیارێتی لەسەر شانە و ئەوەی پێماندەکرێ درێغی ناکەین بۆ بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانمان بەڵام لە هەمانکاتدا





خەڵکیش بەرپرسیارێتیان لەسەر شانە. چل ساڵ بەر لە ئێستا یەکێك لە سەرۆکە مەزنەکانی ئەمریکا جۆن کەنەدی لە قسەیەکدا گووتی مەپرسە کە وڵاتەکەت دەتوانێ چیت بۆ بکات، بپرسە کە تۆ دەتوانی چی بۆ وڵاتەکەت بکەیت؟ بۆیە لەم جەژنە مێژوویی و نەتەوەییەدا داوا لە هەموو هاووڵاتیان دەکەم کە ئەم پرسیارە لە خۆیان بکەن کە ئایا دەتوانن چی بکەن بۆ هەرێمی کوردستان..).

لە وڵاتانی دەوروبەرماندا دەیان خۆپیشاندان دەکرێ، سەرۆکێك جورئەت ناکات ئاوها لەبەرامبەر میللەتەکەی قسە بکات. ئەم جورئەتە تەنیا بۆ کەسێك ناگەرێتەوە کە پێیدەگوترێ نێچیرڤان بارزانی بەڵکو بەشێکە لە رەوشت و رۆشنبیریی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان. بەڵام تۆبڵێی کەلتوری کۆمەڵگاکەمان کەموکوڕی تێدا نەبێت؟ تۆبڵێی میللەتێك بە درێژایی مێژووی خۆی هەر ژێردەستە بووبێ و خۆی بەرێوەنەبردبێ و نەوەد ساڵ لە شەڕدا ژیابێت، شوێنەواری شەڕی بەسەرەوە دیار نەبێت؟

لە وەڵامی پرسیارێکی لەم چەشنەی مندا، مامۆستایەکی زانکۆ نووسیبووی: سەرۆ قادر ئەوەی تۆ باسی دەکەی لە ئەڵمانیا نییە چونکە من ئەوە پانزە ساڵە لەوێ دەژیم و نەمدیتووە! کەچی من مەبەستم ئەڵمانیای دوای ساڵی ١٩١٤ تا ١٩٥٠ بووە واتە ئەڵمانیای دوای دوو جەنگی گەورەی جیهانی. نەك ئەڵمانیای ئێستا کە برینەکانی تیمارکردووەو دەیەوێ سەرۆکایەتی هەموو ئەوروپا بکات. هەر ئەوەش بوو زۆرینەی تیۆریسیەنەکانی دیموکراسی، زۆربەی دکتۆرەکانی دەروونی کە خێریان بۆ دنیا دایەوە، بەشێکی هەرەزۆری زانایانی کۆمەڵناسیی جیهان بەرەگەز ئەڵمانیایین. ئەوانە لە نەخۆشیەکانی دوای جەنگی وڵاتەکەیان کۆڵیبووەوەو جورئەتی چارەسەرکردنی گرفتەکانیان هەبوو. ئەوانە بۆچوون و چارەسەرییەکانیان بە کوفر دانەندرا، بەڵکو پێشوازیشیان لێکردن.



ئێمە کە باسی چاکسازی دینی دەکەین دەزانین پیرۆزترین رەگەزی ناو کەلتورەکەمانە، ئەدی بۆ دەبێ باسی کەموکوڕییەکانی دیکە نەکەین؟ گەر وا نەکەین چۆن دیموکراسی پێشدەکەوێ؟

ئەم گفتوگۆیە و بەرەنگاربوونەوەی بۆچوونەکانی من لە مانگی ئاداردا دروست بوو، شانازی پێوەدەکەم چونکە مانگی بۆنە شۆرشگێرییەکانی ئێمەیە. ئەوەی جێی سەرنجی منە، ئەو ئامانجە ئایدیۆلۆژییانەیە کە کەوتنە ناو مناقەشەکان. هەڵبەت لە دیموکراسیدا هەر کەسێك چ ئایدیۆلۆژییەکی هەیە ئازادە بەڵام ئایدیۆلۆژیا ناکەوێتە ناو پێکهاتەی نیزامی دیموکراسی، بەڵام رێگا بە ئایدیۆلۆژیاکان دەدرێ تا منافەسەی یەکدی بکەن و نوێنەری خۆیان بنێرنە پەرلەمان، بەڵام یاسا لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو دانارێژرێ. دەشزانین لە رۆژگارێکدا دەژین کە سەردەمی حکوومەتی ئایدیۆلۆژیاکان بەسەرچووە. ئاخرین حکوومەتی روخێندراوی ئایۆلۆژیا، حکوومەتی تالیبان و بەعس نەبوو، بەڵکو حکوومەتی حەماسە لە فەلەستین کە دنیا قبوڵی ناکات. دوای جیاوازی و گفتوگۆیەکی زۆر خودی فەلەستینییەکان پێکهاتن، نیزامی نێودەوڵەتی ئینجا هەر لێیان قبوڵ ناکات. بۆ؟ چونکە ئیسماعیل هەنییەمان بینی لە قات و ریباتی سەرۆك وەزیرانەوە بووە کابرایەکی عەگال بەسەری لەبابەت ئەوانەی فەلوجە و رۆمادی، چەند چەکدارێکی دەمامکبەستوی لەپشت سەر وەستابوون و لە بەرامبەری جەماوەر و چاوی کامیراکان وەستابوو هەرەشەی دەکرد و دەیگووت ئەم شەقامانە پر دەکەین لە خوێن! بۆیەش کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لێیان قبوڵ ناکات سەرۆك وەزیرانێکی ئاوهایان هەبێت. ئەو سەرۆك وەزیرە ئایدیۆلۆژیایەکی بەدواوەیە کە دەکرێ رێزی بگیرێ بەڵام ناکرێتە قانوونی حکوومەتی فەلەستین. لە مناقەشەکانی ئێمەدا بێ ئەوەی ئاگامان لێبێت یان مەبەستی راکێشانیانمان هەبووبێت، ئایدیۆلۆژیای لەم چەشنە هاتنەمەیدان.. مەبەستم ئیسلامییەکانە کە حەقی قسە کردنیان هەبوو بەڵام بۆیان نەبوو بیقۆزنەوەو هەڵیگێڕنەوە. کێشەی ئایدیۆلۆژیاکانی ناو کۆمەڵگا کار لە کەلتوری ئەو میللەتە





دەکات، کەلتوریش لە ئەنجامی ئەو چەشنە کێشە و گفتوگۆیانە نوێ دەبێتەوە، بەڵام هیچ ئایدیۆلۆژیایەك بۆی نییە داوا بکات بەتەنیا دارِشتنەوەی کەلتور پاوان بکات.

ئێمە نابی شەرم لە کەموکوڕییەکانمان بکەین. بۆ بە عەیب حساب دەکرێ کاتێك دەڵێین با کرێکارەکانی خۆمان کار بکەن و لە هیندستان و پاکستانەوە کرێکار نەهێنین؟ باشە قەرەباڵغی شارەکانی کوردستان کە رۆژانە شان شانی دەسوێ، نیشانەی خۆشگوزەرانییە یان نیشانەی کارنەکردنی خەڵکە؟ لەکوێ قەرەباڵغی هەبوو لەوێ بێکاری هەیە. لە کوێش بازاری چۆڵت بینی کە خەڵك بە خێرایی دێن و دەڕۆن، نیشانەی ئەوەیە لەوێ کار هەیە و خەڵك مەشغولە و وەختی بەتاڵی بۆ پیاسەی داهێزێنەری شێخەڵایی نییە.

بوژاندنەوەو پێشخستنی کەلتور تەنیا کاری نوخبەی رۆشنبیر نییە، رۆشنبیران و ئاکادیمییەکان تەنیا دەتوانن لە دیاردەکان بکۆڵنەوەو بەدوای چارەسەریدا بگەرێن. لەناو کۆمەڵگادا هەموومان بۆمان هەیە بە ئازادی مناقەشەی یەکتری بکەین. جا لەو مناقەشەیەدا هەرِەشەی گرتن و کوشتن و تەکفیر و هاندانی خەڵك نەك هەر زیانمەندە بەڵکو نایاساییشە. ئەوەی لە مانگی رابردوودا بەرامبەر بە رەخنەکانی من، لە کاردانەوەکاندا بینیمان و بیستمان مناقەشە نەبوو، زمانی هاوچەرخ نەبوو بەڵکو هەڵچوونی پاشکەوتنخوازان و توندڕۆکانی ئەنارشیستی بوو. کەلتوری ئێمە بەو رێگایەی ئەوانە نیشانیدەدەن پێشناکەوێ. لە بەرامبەر ئەنارشیزم و پاشکەوتنخوازاندا پێویستە بە قەناعەتەوە بڵێین درەختی جیاواز بیرکردنەوەمان بەهێز دەکەین تا لێکدی حاڵی بین بەڵام بە زمانی گەیەنەری جوانی هاوچەرخ گفتوگۆ دەکەین. ئێمە پێچەوانەی ئەوەمان بینی کەوا زمانی خاپورکەری هەمەجییە کە دەوڵەتی پێ دروست ناکرێ. زمانی هەندێك لە شەقامەکانی پاکستانە کە بە تفەنگ و شمشێر دەژین و ئوسامە بنلادنیان لەناوخۆیان حەشارداوە. ئەو زمانەی لە هەندێك سایتی ئەلەکترۆنی و رۆژنامەی ناوخۆیی بەکاردێت، زمانی ئاخافتنی میللەتی کوردستان نییە بۆیە بەبێ هەرِەشە و ترساندن دەبێ تێیانبگەیەنین کە برایان ئێوەش



هاوولاَتین و هەقی قسەکردنتان هەیە و مخالیفیش بن تا ئەو رادەی بتەوێ پۆستی نێچیرڤان بارزانی داوا بکەیت، چونکە هەموو موعاریزەکان ئامانجیان دەسەڵاتە، بەڵام با بە زمانێك قسە بکەن کە زمانی هەمووانە، ئەویش زمانی تێکگەیشتنە.

پێویستە رێز لە بێ دەنگی رۆشنبیرانی ناسراوی کوردستان بگرین کە ئەوەی لە خەمی حورمەتی وشەدابوو قسەیەکی نەکرد و خۆیان تێکەڵی ئەنارشیزم نەکرد. لەوانەیە قسەی خۆیان هەبێ و لە داهاتوودا بینووسن، بەڵام ئەوەی کە سەرنج رادەکێشی رۆشنبیرە باشەکان، ئەوانەی ناسراون و خوێنەریان هەیە، لەوانەیە مخالفی بیروڕاکانی منیش بن بەڵام جارێ دوور وەستان و دەیانزانی نابێ زمانی نووسین و گفتوگۆ بۆ کارکردن لەسەر چاکسازی لە حکوومەت و کەلتوردا بەو زمان و شێوازە هەمەجییە بێت کە توندڕۆیەکان گرتویانەبەر. یەکێك لەمنی پرسی ئەگەر تۆ خۆت سەردانی هاندەرانی ئیمزا و خۆپیشاندانەکانت کردبا پەلاماریان نەدەدای و لەوانە نەبوو گیانت بکەوێتە مەترسییەوە؟ خۆ ئەگەر نوسەرێکی بێ دەسەڵاتی فەقیرحاڵ بوایە ئێستا رای کردبوو بۆ دەرەوەی وڵات! جا ئێستا رۆژنامەکانی ئەوروپا لەسەریاندەنووسی کە چۆن لەسەر دەربڕینی رەئی، نووسەرێکی دیکەیان دەرپەڕاند! لەوانە بوو پێمانبڵێن لە سوید کچەکانیان دەکوژن و لە ناوەوەش جیاوازی بیروڕا لێکدی قبوڵ ناکەن. لەم روانگایەوە سوپاسی بێ دەنگی نووسەر و رۆژنامەنووس و ئاکادیمیە باشەکانی کوردستان دەکەم.

لە کۆتاییدا منیش گوێتان بۆ دەگرم، ئەگەر هەڵەبووبم دەگەرێمەوە، ئەگەر فکری باشتان پێبێ لێتان فێردەبم. وەك پیشەی هەمیشەم چەند دەقیقەیەك لە وەختی خۆم تێپەڕیم بۆیەش داواتان لێدەکەم ببورن.

## پرسیاری خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی

*(خویندکار لە کۆلێژی یاسا): ئەو قسانەی جەنابت کردوونت هیچ بەڵگەیەکی یاسایی لەسەر دروست نابێ کە بدرێیتە دادگا. ئایا لایەنێکی سیاسی بۆ ئامانجی خۆی هانی ئەم خەڵکەی نەداوە؟ بە تایبەتی کە تۆ باسی مەسەلەیەکی گرنگت کردووە ئەویش مەسەلەی گەندەڵی و پێویستیی شەفافیەتە.

*(خوێندکار لە کۆلێژی سیاسەت): زۆربەی ئەوانەی ئیمزایان دەکرد قسەکانی تۆیان نە بیستبوو نەخوێندبۆوە، تۆ کارێکی باشت کرد بە جورئەتەوە قسەکانی خۆت بڵاوکردەوە. ئێستا قوتابیەکانی زانکۆ تێگەیشتوون. من خۆم یەکێکم لەوانەی ئیمزامکردبوو بەڵام بابەتەکەم لەلا روون نەبوو. بۆیە ئەمرۆ بە خواستی خۆمان بۆ پشتگیریت هاتووین. پرسیارم ئەوەیە بۆچی هەندێك سیاسی و ئاکادیمی ناسراوی سلێمانی ئەم هەڵەیان قۆستەوەو بۆ کاری سیاسی ئێمەیان بەکارهێنا؟ تۆ رووی قسەت لە لێپرسراوان بوو کە گەندەڵ نەبن و شەفاف بن، باسی خەڵکت نەکردووە.

* (خوێندکار لە کۆلێژی سیاسەت): تۆ ئەگەر وەك نووسەرێك پۆستێکی رەسمیت نەبایە و ئەم قسانەشت کردبا، ئایا دەستخۆشیان لێدەکردی یان ئەوەیان دەکرد کە کردیان؟

* (خوێندکار تەلار محەمەد کەریم): بۆچی قسەکانت هەندێکی قرتێندرابوو؟ بۆچی هەمووتان دانەبەزاند تا قسەی زیاتری لەسەر نەکرێ؟ لەلایەکی دیکە ئایا ئەوە خودی یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکرات نین لەم رێگایەوە پەلاماری یەکتر دەدەن، ئایا ئەمە پرۆسەی پتەوکردنی حکوومەتی یەکگرتوو خاو ناکاتەوە؟

* (خوێندکاری کۆلێژی کشتوکاڵ): ئەوەی من دەیزانم شتێکیان بۆ تۆ هەڵبەستووە کە هەر وجودی نییە.

* (خوێندکار لە کۆلێژی راگەیاندن): کۆمەڵێك نووسەر پێش تۆ بە مێگەل و ئاژەڵ ناوی خەڵکیان هێناوە و کەس هیچی پێنەگووتون؟



* (خوێندکارێك): دەقی کۆرەکەت درەنگ لە کەناڵی زاگرۆس بڵاوکرایەوە و ئەوەش وایکرد هێرش و باسەکان زیاتر بن و لای خەڵکیش نیگەرانی دروستکرد. پێتوانییە راگەیاندنی پارتی دیموکرات کەمتەرخەمی کرد؟

* (خوێندکار لە کۆلێژی پزیشکی): من گلەییم لە کوران و کچانی خوێندکار هەیە چونکە پێش ئەوەی وتارەکەت بیخوێننەوە کەوتنە ناو فەوزایەکە. ئێستا ئەوەی دیتمان و خوێندمانەوە هیچی ئەوە نەبوو کە لە سلێمانی کاری لەسەر دەکرا. باشە بۆچی گەنجان هەڵوێست لەسەر ئەو وتارخوێنانەی ناو مزگەوتەکان وەرناگرن کە هەموو رۆژێ هێرش دەکەنە سەر ئازادییەکانی گەنجان و خەڵکی لە دژمان هان دەدەن و بە فاسد و لادەرو میکرۆبی کۆمەڵگا ناومان دەبەن؟

* (خوێندکاری زانستە سیاسییەکان): ئەم قسانەی تۆ هەواڵێکی لەسەر بڵاوکرایەوە کە ئەو هەڵایەی لێنرایەوە، ئێوەش خاویتان نواند لە زووتر روونکردنەوە.

* (خوێندکار لە زانستە سیاسییەکان): پرسیارم ئەوەیە قسەکانی تۆ بۆ خەڵکی سادەبوو یان بۆ نووسەران و نوخبە یان بۆ مشتومڕی نێوان حزبەکان؟

## وەڵامی پرسیارەکان، سەرۆقادر:

بۆ ئەوەی وەخت زۆر نەگرم، بەگشتی مناقەشەیەکی پرسیارو بیروڕاکان دەکەم. جارێ ئەو کۆڕەی من کە بینیتان بۆ ڕاگەیاندن نەکرابوو بۆیە تەلەفزیۆنەکان باش تۆماریان نەکردبوو. مەبەستم ئەوە نییە کە نەدەبوا ئەم قسانەم بڵاوبێتەوە، چونکە پێش ئەو سمینارەم، بە دوو بەشی درێژ ئەم رایانەم لە گۆڤاری گوڵاندا بڵاوکردەوە. ئەوە سەرنووسەری بەرێزی گۆڤارەکەش لێرەیە. تێبینی جیاجیاشم لەلایەن خەڵکەوە بەدەست گەیشت. من پێش هەموو شتێك شانازی بە نووسەری و رۆژنامەنووسی خۆمەوە دەکەم، جا زۆریش شانازی بەوەوە دەکەم کە رۆژنامەنووسێکی سیاسیشم، هەمیشە لایەندار بوومە و پێموانییە لایەنداریێتی سیاسی قەت عەیب بووبێت، ئەوە شێوازێکی کاریگەرە بۆ کارکردن لەسەر کۆمەڵگا. هەر ئەوە وایکرد قسەکانی من بۆ مەبەستی سیاسی بقۆزرێتەوە. هەڵبەت ئەگەر بۆ راگەیاندن یان لە هۆڵێکی گەورەدا قسەم کردبان ئەوە بە کورتتر و دیقەتی زیاترەوە دەدوام. جا من خەڵکی لای بیتوێن و پشدەرم و سەراحەتێکی مەنگوڕیانەم هەیە. هەروەها سەرۆکی ئەو رێکخراوەی منی بۆ ئەو بیروڕایانە دەعوەت کردبوو، لێرەیە و قسەکانیشم دەبوو بە مڵکی ئەوان، دوایی چەندیان لێوەردەگرت و چەندیان لێ تەرك دەکرد ئەوە لە دەسەڵاتی ئەواندا دەبوو. هەر لە جۆری قسەکردنەکەم دیار بوو، لە کاتێکی زۆر ماندوو هاتبووم. لەسەر ئیشەوە هاتم، ئەگەر ئیلتزام نەبوا هەر تاقەتی قسەکردنم نەبوو، بەڵام دەمزانی دەڵێم چی! ئەو قسانەی گوتنم زۆر بە تەرکیزەوە نووسیبوونم و ئەگەر زانیبام بۆ بڵاوکردنەوەیە باشترم دەرمەدەبرین. ئێستاش لەسەر پێشنیاری ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکاران کە دەیانویست بێنە هەولێر، من دێمە زانکۆی سلێمانی، جارێکی دیکە ئەم قسانە بە فراوانتری دەکەمەوە. پێش هاتنیشم مخالیفەکانم دەعوەت دەکەم تاکو بێن و پێکەوە گفتوگۆیەکی باش بکەین. تەنانەت ئامادەم گفتوگۆیەکە بە راستەخۆیی لەرێگای سەتەلایتەوە بگوازینەوە تا هیچ رایەکی تێدا نەشاردرێتەوە.



قسەکانم بۆ کاری سیاسی بەکارهێندرا چونکە لە وڵاتی ئێمە تاکو ئێستا کێشەی سیاسی ماوە. ئەو کێشەیە لە نێوان پارتی و یەکێتی بە مانا توندەکەی کۆتایی هاتووە و هەردوو حزب هاوپەیمانن لە بەرێوەبردنی حکوومەتی عێراق و حکوومەتی کوردستان. هەردوو حزب شەریکن لەو حکوومەتەی کە ئێستا لە کوردستان خەڵك چاوەروانی لێی هەیە.

بەڵام دیاردەیەکی دیکە هەیە، ئەویش هەموو حزبەکانی دیکە بێ جگە لە پارتی و یەکێتی، هەموویان وەزیریان لە حکوومەتی کوردستاندا هەیە کەچی هەر خۆیان بە موعارز دەزانن و بۆ روخاندنی کار دەکەن. بەڕای من ئەگەر یاسا کاری پێبکرێ، لەوانەیە رۆژگارێك بێت خەڵکانێك لێیان بپێچرێتەوە. ئەو حزبەی موعاریزە و بۆ روخاندنی حکوومەت کاردەکات بۆچی بەشداری تێدا دەکات؟

من بەختەوەرم کە پێشمەرگە بووم بۆیە دەتوانم لەسەر ئەوانیش قسە بکەم، قسەم لەسەر بزووتنەوەی سیاسیش کردووە. لەوانەیە یەکێکی دیکە نەیتوانیبا یان رێگای بەخۆ نەدابا یان لە بەرژەوەندی دانەبایە ئەو قسانەی من بکات. جا کە من لە سمینارەکەمدا گووتومە نیفاق و نەخۆشی لە کۆمەڵدا هەیە و لەناو بزووتنەوەی سیاسیشدا هەیە، مەبەستم وەڵامی ئەو پرسیارانەی ئێوەیە و ئەمە نموونەیەکە لەو نیفاقە. ئەم نیفاقە قسە بۆ ئامانجی سیاسی هەڵدەگێرێتەوە و بەمەیش ئازادی بیروڕا تیرۆر دەکات، ئەوە کوشتنی مافە مەدەنییەکانی ناو کۆمەڵگایە کە هەمووتان هەوڵی بۆ دەدەن. جا پێش هەمووشیان پلیشاندنەوەی گەنجەکانە کە لەسەرەتای ژیاندان و هەموو ئەو تەجرەبانەی ئێمەیان نییە. دێن رێگای تەجرەبەکردنی لێدەگرن و مافەکانی پێشێل دەکەن و رێگای لێدەگرن بەشداری لە بەرێوەبردنی وڵاتدا بکات.

بە راشکاوی قسەکردن نەك هەر کارێکی باشە بەڵکو یەکێکە لە سیفەتەکانی نیزامی دیموکراسی. یەکێك لە پرەنسیبەکانی کۆمەڵگای دیموکرات و ئازاد ئەوەیە کە راشکاو بێت و کار و ژیانی خۆت نەشارێتەوە. هەڵبەت تا ئەو جێگایەی پەیوەندی بە بەرژەوەندی وڵاتەوە هەبێ. بۆیە پێموایە سەراحەتەکەی من کارێکی زۆر باش بوو





بەڵام قۆزتنەوەکەی کارێکی زۆر دزێو بوو. هەر بۆیەش ئەوانەی هەلیاندەقۆزتەوە لە کۆتایی ئەو گفتوگۆیە یەك مانگ و نیوەدا، ئێستا دەموچاوی خۆیان شاردۆتەوە.

یەکێك لە کارە ناقانوونی و خراپەکانی ئەو بەشە لە راگەیاندنی چەواشەکار ئەوە بوو کە سەرەڕای ئەوەی دەقی دەنگی منیان دزی بوو، دەقی دەسکارینەکراوی قسەکانی منیان بڵاونەکردەوە. من زۆر چاوەڕوان بووم ئەو شەهامەتە بنوێنن. ئەوجا روونیانکردبایەوە کە لەسەر کام قسەیە دەبوا من ئیدانە بکرێم یان بدرێم بە دادگا. بۆیەش پیلانەکەیان سیاسی بوو بۆ سەر پارتی دیموکراتی کوردستان. ببورن بەشێکی زۆر لە ئامادەبوان پارتی نین و من نامەوێ لەم میوانداریەدا تەنیا دیفاع لە پارتی دیموکراتی کوردستان بکەم. لەوە زیاتر، هێرش کرایە سەر سەرۆکی کوردستانیش کە تەنیا سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان نییە. لە هەموو وڵاتانی دیموکراتدا هێرش کردن بۆ سەر سەرۆکی وڵات ناقانونییە و پێویستە داواکاری گشتی بەدوایدا بچێ چونکە ئەوە حەقی عامە و پێشێلکردنی سەروەری وڵاتە. ئەمە پەلامارەکانی سەر سەرۆکی حکوومەت و پەرلەمانیش دەگرێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە من لەوێ گووتم باسی شەفافیەت دەکەم، ئێستاش ئەو قسەیەی لەوێ کردم، لەبەردەمی ئێوەش دووبارەی دەکەمەوە و ناتوانم لەگەڵ ئێوەش شەفاف بم. بە حوکمی ئەو پۆستەی هەمە دەزانم کوێ و کوێ و کوێ لە پشتەوەی ئەو هێرشە خراپە دان، دەنگیان هەیە، وەسڵی پارەیان هەیە و حکوومەتی بیانیشیان لەپشتن و کۆمەڵێك ئامانج یەکیانگرتۆتەوە. کەواتە دەبێ چاوەڕوان بین بۆ دژایەتیکردنی هەر پرۆژەیەکی باش، کەسانی جیاجیا کە ئامانجیشیان وەکیەك نییە، کۆدەبنەوە.

ئەم حکوومەتە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە سەرکردایەتی دەکرێ و هەردووك لایان تێیدا بەرپرسن. هێمنی ئەم وڵاتە بە جەنابی مام جەلال و سەرۆك بارزانی رادەگیرێ. جا ئەگەر لە زانکۆکان و دەزگاکانی راگەیاندندا کەسانی دەستڕۆیشتوو لە پشتەوە هانی خەڵکیان دەدا، ئەوە دیسان دەمانگێرێتەوە سەر ئەو پرسیارەی من کە: ئایا کۆمەڵگایەکی ساغمان هەیە؟



پەندێکی کوردەواری هەیە دەڵێ: کاتێك خەڵك شێت دەبن دەیانبەنە لای ئۆمەرمەندان، ئەی ئەگەر ئۆمەرمەندان شێت بوو خەڵك چی بەسەر دێت؟ سلێمانی شارێکی زیندووەو شاری هەموومانە، مەڵبەندی فەرهەنگ و سەرهەڵدانی فکری نوێیە. بارزانی نەمر بەشێکی ژیانی خۆی لەوێ بردەسەر هەروەك چۆن شێخی نەمریش کوڕی ئەوێیە. هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەوێمان قبوڵە بەڵام با قودرەتی گفتوگۆ لە فەوزادا ون نەکرێت. کەسانێك لەم کێشەیەدا تایبەتمەندییەکانی ئەم شارەیان قۆستەوە، گەنجی بێتەجرەبە لە دیوەخانەکانی ئەوان دەردەچوون و فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکردن کە هەمووی تیرۆر و ناحەقی بوو. نەدەبوا لەو شارەدا ئەم دیاردە ناشیرینە روودات.

یەکێك لە ئێوە دەپرسێ ئەگەر بێ لایەن بایت ئەم هەڵڵایەت لەسەر دروست دەبوو؟ ١- منیش ئەم پرسیارە دەکەم. ٢- من جیا لەوەی رۆژنامەنووس و نووسەرم، پلەیەکم هەیە پەیوەندی بە کاری رۆژنامەنوسیەوە هەیە و کار لە کەلتوری وڵاتەکەمان دەکات، بە هۆی کارەکەشم ئاگام لە زۆر شت هەیە، بۆیە ئەرکی من لەو کەسانە گرانترە کە لە من زاناترن بەڵام ئەم زانیارییانەیان نییە، ئەگینا لەوانەیە جوانتر و رێکوپێکتر بیلێن. بۆیە کارێکی باشم کرد کە ئەو سمینارەم کرد و ئەوە نیشانە زیندوویەتی ئەو حکوومەتەیە کە من دیفاعی لێدەکەم. بۆیەش دەقی قسەکانی سەرۆکی حکوومەتم (بەرێز نێچیرڤان بارزانی) بۆ خوێندنەوە. ئەو دەیەوێ رەخنە لە دیاردەی بێکاری بگرێ یان ئەوانەی چاوەڕوانی موچە دەکەن و کار ناکەن. کەواتە دەیەوێ بەبیرمان بێنێتەوە چاوێك بە قەدو باڵای کەلتوری وڵاتەکەماندا بگێرینەوە تا بەهێزتری بکەین.

یەکێکتان پرسی: دەبوا لێپرساوەکان، من بدەنە دادگا نەك خەڵك. خۆ دیارە هەندێك لێپرساوی حزبی کە ئەم رەوتە لە بەرژەوەندییان دەدات، ئەو ئاژاوەیان لە سلێمانی بەرێخست. ئەوانەی رای منیان خوێندۆتەوەو مخالیفی منن بۆچوونیان سەرسەرم، بەڵام بۆ جارێکی دیکە ئەگەر یەکێکی دیکە رای خۆی گووت، هەنگاوی

یەکەم گوێی لێبگرن و تێی بگەن دوایی قسەی لەسەر بکەن. با فێری گفتوگۆبین. بیستووتانە سەرباری جیاوازییە فەردی و فکرییەکانی نێوان رۆسۆ و ڤۆلتەر، قسە سادەو بە ناوبانگەکەی ڤۆلتەر بەدرێژایی مێژوو مایەوە کە گووتی: خۆم دەکەمە قوربانی بۆ ئەوەی نەیارەکەم بتوانێ رای خۆی دەرببڕێت.

ئەو لێپرسراوانە تەنگاو بوون بۆیە خەڵکیان هاندا نارەزایی دەربڕن. ئەو لایەنانە نایانەوێ حکوومەت بیر لە چارەسەری گەندەڵی و کاری شەفافیەت بکاتەوە. کەچی دەبوا رای ئەوانە وەکو رای بەرێز نێچیرڤان بارزانی بوایە چونکە ئەگەر وڵات بەرەو گەندەڵی و مەترسی بڕوات، شەخسی ئەو دەکەوێتە بەر مەترسی.

شەفافیەت کارێکی ئاسان نییە. دیوتانە من ناوی ئەو کەسانە ناهێنم کە رای گشتیان شێواند، کەواتە شەفاف نیم. ئەگەر ناویان بێنم سبەینێ قەیرانێکی لەوە گەورەتر دروست دەکەن. ئەوەیە وامان لێ دەکات هەمووومان هاوکاربین تا ئەم کەلتورە بگۆڕین و سانسۆری گەندەڵان بشکێنین.

سەبارەت بە مونتاژکرانی کۆڕەکەی من، ئەمانەت پارێزراوە و دەقی ئەو رەئیانەیان بڵاوکردۆتەوە کە من لێیان بەرپرسم بەڵام هیچ تەلەفزیۆنێك ئامادە نییە دوو سەعات قسەکردنی من بەبێ دەسکاری هونەری خۆیان و کورتکردنەوە بڵاوبکاتەوە. کات لە تەلەفزیۆن و رادیۆکاندا بایەخی هەیە. بەڕێوەبەر و سەرنووسەرەکان بەپێی سیاسەتی خۆیان مامەڵە لەگەڵ هەر ماددەیەکی راگەیاندن دەکەن، لەلایەکی دیکەوە خەڵکیش بە سەلیقەی خۆی دەیەوێ لە ماددەیەکی دوورودرێژدا خۆی ماندوو دەکات. ئەوجا شاهیدیشمان لێرە دانیشتوون کە ماددەکە بۆ بڵاوکردنەوە تۆمارنەکرابوو، بۆیە کەموکوڕی لە وێنە و دەنگدا تێدا بوو. بەڵام ئەو قسەیەی کە بۆ من هەڵبەستراو بەنیازی خراپ شێوێندرا، ئەوە رستەیەکی دوورودرێژی من بوو کە قۆزترایەوە و بە خراپی لە خەڵك گەیەندرا. من گووتم وەزیری گەندەڵمان هەیە و هاووڵاتی گەندەڵیشمان هەیە. واتە ئەو کەسەی لە کاتی



هەڵبژاردنەکاندا دەنگی خۆی دەفرۆشێ، ئەگەر کرا بە وەزیر چی دەکات؟ ئەو قسەیەم بۆ ئەوە بووە لە هەڵبژاردنەکانی داهاتودا ئەو داب و نەریتە بگۆڕدرێ.

سەبارەت بە وشەی شەهامەت، من بەو مانایەم بەکارهێنا بوو کەوا کۆڕەو بۆ خۆمان نەك هەر تەحەدایەك بوو کوردستانی بەرەو ئازادی برد بەڵکو یاساکانی نێودەوڵەتیشی گۆڕی. ئێستا هەموو گوندەکانی کوردستان ئاوەدانن. ئایا ئاو و کارەبا ئەگەر لە هەولێر و سلێمانی کەم بوو، داوادەکەن لە گوندەکان هەبێت؟! ئێستا کە گوندەکانمان چۆڵن و بەرهەمی کشتوکاڵ نەماوە، هۆکاری زۆر تێدایە و تەنیا جوتیارەکان نین، بەڵام ئەگەر بمانەوێ رەخنەیەك لە باری ئابوری و داب ونەریتی بەرهەمهێنانی خۆمان بگرین، دەبێ بڵێین گوندییەکان توانای تەحەداکردنتان کەمبۆتەوە بۆیە بەرەو شارەکان رەو دەکەن.

ئەگەر ئەم قسەی من هەڵەیە، ئێ خۆ کفرم نەکردووە. لە زمانی عامەدا وشەی شەهامەت و تەحەدا و نەوێران و ترسان هەمووی یەك مانای لێکنزیکی هەیە. بۆ نموونە یەك بە یەکێکی دیکە دەڵێ: دە شەهامەتت هەبێ وەڵام بدەوە یان فلان هەڵوێستە وەربگرە..من چواردە ساڵ لە گوند ژیاوم، بەشێکی دیکەی ژیانی خۆم لە ئۆردوگا بردۆتەسەر، بۆیە دەزانم ژیانی گوند و ئۆردوگایەکان چۆنە. کاتێك هەندێك وشە بەدحاڵیبوون دروست دەکات ئەوە من دێم روونی دەکەمەوە کە مەبەستم چیە. لێرە ئامانجی من فکرە، ئەگینا یەکێك لە پێگەی سیاسی و رۆژنامەنووسی مندابێت و پێشمەرگەش بووبێت، نەك جاش! لەو رۆژگارەی گوندەکان راگوێزرابوون ئێمە لەوێدا پێشمەرگەبووین، چۆن دێم سوکایەتیان پێدەکەم؟

ئەو زمانە سوکەی دژمان بەکارهێندرا گەیشتە سنوری بێمەنتقی بۆیە وازم لە خوێندنەوەی هێنا، ئەوەی گرنگە نەیەڵێن ئەو بێمەنتقییە بگاتە ناو راگەیاندنی کوردستان و لە ناو زمانمان جێنەکاتەوە. هەندێکجار لە شوێنێکی داخراودا چەند کەسێك گفتوگۆی کراوە دەکەن، کە هاتەسەر بڵاوکردنەوە لەوانەیە رێکوپێك بکرێ و هەندێك کەسیش رای خۆیان بۆ بڵاوکردنەوە نالێن و رازی نابن بەبێ رەزامەندییان

بگەیەندرێتە خەڵك. ڕۆژنامەنووسان دەزانن جاری وا هەیە کەسێك زانیاری و بیروڕات دەگۆڕێتەوە بەڵام ڕێگانادات بڵاوبکرێتەوە. پاراستنی ئەمانەت بەشێکی گرنگی پەیمانی شەرەفی ڕۆژنامەنووسییە. لە هەمان کاتدا مافێکی یاساسیشە. کەچی ئەوانە دەنگی منیان دزی، ئەوجا شێواندیان و خەڵکیان پێی لەدژم هانداوە! کەسان و لایەن هەن بەرژەوەندییان لە حکوومەتی یەکگرتوو و مەدەنی و شەفافدا نییە بۆیە ئەم گۆبەندەیان نایەوە. ئەوانە کێن و لە کوێن؟ کەیفی خۆیانە. بەڵام ئەوەی جێگای خۆشحاڵییە ئەوانە کاریگەر و بڕیاردەر نین. بڕیار ئەوەیە کەوا دراوە: حکوومەت یەکە، هەڵوێست لە بەغدا یەکە، ئینشاڵا ڕاگەیاندنی حکوومەتی سەربەخۆی کوردستانیش هەر یەك دەنگ دەبێ.

لێمدەپرسن بۆ ڕاگەیاندنی کوردستان لەم بەزمەدا بێ دەنگ بوو؟ ١- ئێمە ڕاگەیاندنێکی گەورەمان لەبەردەستدایە بۆیە هەر کە قسەمان لەسەرکرا بیکەینە قیامەت، ئەوە بەجارێك خەڵکمان بەخۆراییی نیگەران دەکرد. ٢- دوور نەبوو هەر ئەو دەستە شاراوانە بە کێشەی ڕاگەیاندنی نێوان پارتی و یەکێتی لە خەڵك بگەیەنن. ٣- لەوانە بوو بڵێن ئەوە پارتیە و دژی یەکێتی قسە دەکات. ٤- لە هەمووی ترسناکتر لەو کاتدا بەڕێز مام جەلال نەخۆش کەوت و ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵیدەدا نیگەرانی خەڵکی کوردستان بۆ تەندروستی سەرۆك کۆماری کوردان لە عێراق، نیشان بدات و هەمووومان ئاواتەخواز بووین بەوپەڕی سەلامەتی بگەڕێتەوە سەر کاری خۆی. کەسانێك لەولا و لایتر هەبوون دەیانویست نەیەڵن ئێمە ئەم کارە باشە بکەین. وەك دەزانن نەخۆشیی بەڕێز مام جەلال کاریگەری لەسەر حکوومەتی عێراق و حکوومەتی کوردستان و حزبەکەی خۆشی هەبوو. ئەوە نیشاندەری کاریگەری ڕۆڵی مام جەلالە لەسەر واقیعی سیاسی. ئەوە لە حزبەکەی خۆیەوە دەستی پێکرد تا کۆشکی سەرۆکایەتی بەغدا. لەوکاتەدا ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان دانی بەخۆداگرت تا غەدری لێبکرێ بەڵام ئەم پیلانانە سەرکەوتن نەبینن.



کاتێك زانیمان مەسەلەکە گرنگە و خەڵکیش دەپرسن، ئەوجا هاتین کۆڕەکەمان بڵاوکردەوە. نایشارمەوە، حکوومەتی هەرێمی کوردستان کە پارتی دیموکراتی کوردستانیشی لەپشتە، بەتەمایە مەسەلەی شەفافیەت و لێکۆڵینەوەی گەندەڵی بکات بە مەسەلەیەکی سەرەکی خۆی. بەڵام بە هێمنی و ئامانجدار و بە هاوکاری خەڵك و نەشاردنەوەی ڕاستیەکان. ئەگەر لە شەفافیەتەوە دەست پێ نەکەین چۆن دەتوانین کەموکوڕییەکان و گەندەڵی بدۆزینەوە؟ جا ئەگەر شەفاف بوون چاکە، ئەو کەسەی شەفاف بوو لە دەمی نەدرێ باشە. قەیدی من ناکات بەڵام لەمەودوا با هاوکاری یەکدی بکەین تا خەڵکی دیکە نەترسێن و ڕای خۆیان بڵێن.

## تیرۆری فکر و تیرۆری جەستە هەیە(*)

ماوەیەك بەر لە ئێستا، یەکێك لە ڕێکخراوە مەدەنییەکانی شاری هەولێر سیمینارێکی داخراویان بۆ من بەست کە تەنیا بیست کەس لە مامۆستایانی زانکۆ و نووسەر و ڕۆژنامەنووس بەشدار بوون. ڕێکخراوی ناوبراو داوای لێکردبووم لەسەر هەردوو دیاردەی گەندەڵی و شەفافیەت لەنێوان حکوومەت و میللەتدا باسێك پێشکەش بکەم و لەلایەن بەشداربووانیشەوە مناقەشە بکرێت. ئەم سیمینارە بە هیچ شێوەیەك بۆ ڕاگەیاندن نەبووە، تەنیا ڕێکخراوەکە خۆی لە دواییدا وەك بەشێك لە کارە ڕۆشنگەرییەکانی بڵاوی دەکاتەوە.

تا ئێستاش دەقی تۆمارکراوی ڤیدیۆیی سیمینارەکە لای من ماوە. لەوێدا زۆر بە ڕاشکاوی باسی دیاردەی گەندەڵی و کەموکوڕییە کەلتوریەکانی کوردستانم کردووە و بەستومەتەوە بە وابەستەیی ئێمە بە عێراقێك کە بە درێژایی نەوەد ساڵ شەڕمان لە دژی کردووە و ئێستاش شەڕی ناوخۆیی عەرەبی، خودی بەشە عەرەبیەکەی عێراق دەهاڕێ.

(*) ئەم وتارەم لە گەرمەی هاندانی ڕای گشتی و وروژاندنی ئاینی لەدژی من، لە گۆڤاری گوڵان بڵاوکردەوە.





بەشێکی دیکەی باسەکەی من دیاریکردنی ئەو گیروگرفت و نەخۆشییە کۆمەڵایەتیانە بوو کە هەموو میللەتان دوای شەڕی درێژخایەن تووشی دێن و کوردیش هەروایە. لەوێدا بە نموونە باسی گەندەڵی سیاسیم کردووە کە چۆن لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا خەڵکانێك هەن بە پارە رای خۆیان دەدەن. ئا لەوێدا نموونەیەکی چیرۆکنووسی ناوداری تورك عەزیز نەسینم هێناوەتەوە کە هیچ پەیوەندی بە سوکایەتیکردن بە میللەتی کوردەوە نییە. ئەوە لەلایەن ناحەزانی منەوە بە شێوێندراوی دەرخواردی هاووڵاتیان دراوە. لەبەر گرنگی باسەکەش هەفتەی داهاتوو خودی باسەکەم لەم گۆڤارەدا (گوڵان) بڵاودەکەمەوە، هەر وەك چۆن کورتەیەکی لە تەلەفزیۆنی کوردستاندا بڵاوکرایەوە. سەرباری ئەوەش بۆ دڵنیایی هاووڵاتیان من بە رەسمی داخ و داوای لێیبووردنی خۆمم دەربڕی کە ئێستا لەم نووسینەشمدا چەند بارەی دەکەمەوە.

هەندێك ناوەندی سیاسی لە شاری سلێمانی، ئەم باسەی منیان شێواند و بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە سەربەستی بیروڕا و مناقەشەکردنم، کەوتونەتە هاندانی هاووڵاتیان لە دژی من و راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان. لەو کارەشیاندا هەموو پێوەرە دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ و راستگۆیی راگەیاندن و رەوشتە بەرزەکانی میللەتەکەمانیان شێواند. ئێستا جموجۆڵەکەیان بە ئاشکرا بۆتە دژایەتیکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەگینا خودی ئەو پەیامنێرەی بە هەڵچوونەوە هەواڵەکەی لەگەڵ کۆڵێك سوکایەتیکردن بە من لە سایتێکی سەر بەو ناوەندەی سلێمانی بڵاوکردبۆوە کە ئەم شێواندنکاریە دەکات، لە نامەیەکی رەسمیدا دانیپێداهێنا کەوا بە شێواوی و لێتێنەگەیشتن کارەکەی کردووەو داوای لێبووردنیشی لێکردووم. کەچی ئەو ناوەندەی ناوبراوی سلێمانی کە لەگەڵ هەندێك وتارخوێنی توندڕۆی سەر بە ئیسلامیە توندرۆکان لە مزگەوتەکان، لەسەر شێواندن و هاندانی خەڵك بە مەسەلەیەك کە هیچ راستی بۆ نییە، بەردەوامن. بۆیە ئێستا هەڵویستەکەیان کارێکی سیاسییە و دژی پارتی دیموکرتی کوردستانە و هیچ مانایەکی دیکەی نییە.





لەلایەکی دیکەشەوە پێشێلکردنی ئازادی بیروڕا و شێواندنی سومعە و هەڕەشە و مارەسە کردنی تیرۆری فکری و جەستەییە دژی من و ئەندامانی خێزانەکەم. ئەمەشیان لە حکوومەتێك ناوەشێتەوە کە خۆی بە زامنکاری ئازادی و دیموکراسی دەزانێ. جا بۆیە ئەم کێشەیە بۆ یاسا و رای گشتی و رووناکبیران بەجێدێڵم و تەنیا پرسیارێکم هەیە: ئەرێ چ داهاتوویەکمان دەبێت کە تیرۆری فکری و هەڕەشەی جەستەیی لەسەر فکر بگاتە ئەم ئاستەی ئێستا و خەڵکانێك بە ئاشکرا مینبەری هەندێك مزگەوت و بڵنگۆی سەر شەقامەکان بۆ لەناوبردنی نووسەرێك بەکاربێنن؟

## دووەمین دیدار لەگەڵ خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی

بەناوی خۆم و هاوکارانم لە دەزگاکانی راگەیاندنان، بەخێرهاتنی گەرمتان لێدەکەم. جارێکی دیکەش ئەو خۆشحاڵیەی خۆم بەرامبەر بە زیندوویەتی خوێندکار و قوتابیانی کۆلێژەکانی زانکۆی سلێمانی دەردەبڕم کە بەرامبەر بە هەموو بوارە گرنگەکانی پەیوەندار بە چارەنووسی وڵاتەکەمان هەیانە. هەڵبەت هەوڵدەدەم قسەکانی پێشووم چ لە کۆڕی شەفافییەت یان لە کاتی پێشوازی یەکەمم لەو خوێندکار و قوتابیانەی وەك ئێوە بە حەزی خۆیان بۆ گفتوگۆکردن هاتبوون، دووبارە نەکەمەوە.

لێتان ناشارمەوە، ئەوەی لە کۆڕەکانی پێشوومدا گوتومە هەڵەیەکی لەزاردەرچوو نەبوو تا ناچاربووبین خەڵکی بۆ کۆبکەینەوە و پاساوبێنینەوە، بەڵکو راگەیاندنی رێبازێکی نوێ بووە لە راگەیاندنی کوردستاندا پەیرەودەکرێ. لەم کارەماندا سەرۆکی حکوومەتی کوردستانیشمان ئاگادار کردووە کە پشتیوانی پرۆسەکە بکات و دەزگاکانی حکوومەت ئامای گوێگرتنی زیاتر لە پێشوو بێت بۆ ئەو پێشنیار و ئاشکراگۆییەی دەکرێت. هەروەها تەحەمولی شەفافییەت بکات و گوێ بگرێت کە دیاردەی گەندەڵی ناوەرۆك و روخسارەکانی چۆنە و بە چ شێوەیەکیش باس دەکرێت.

لە کۆڕی یەکەمدا، لەسەر کار و بە ماندوویەتی دەستم بە قسەکردن کرد بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر لەو چەشنە ئیرتجالی قسەکردنەدا دیققەتی پەیڤەکان یەك لەدوای یەك، بەوشێوەیە نەیەن کە پێویستە، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە لە یەك وشەی کۆڕی یەکەمم پەشیمان بم. ، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی کۆڕە بڵاوکراوەکەم، دیفاع لە پەیڤ بە پەیڤی دەکەم، مەبەستم ئەو دەقەیە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بڵاوکرایەوە.

ئێستاش جارێکی دیکە لەگەڵتان دەکەومە گفتوگۆ و حەز دەکەم لەو کەسانەشتانەوە دەست پێبکەم کە هێندە موخالیفی منن تەنیا نایانەوێ سەرم ببڕن، لە موخالیفی ڕەئیەوە تا موخالیفی سیاسی، ڕێباز، شەخسی من و ئەو حزب و ڕاگەیاندنەی من کاری تێدا دەکەم. بەو هیوایەی بگەینە ئەو چارەسەریانەی بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەمان سودیان دەبێ و بە کەڵکی چاکسازی دێن. هیوادارم ئەوانەی موافقی منن، چەندی دەکرێ بێدەنگ بن، ئەگینا با شتێکیان پێبێت بخرێتەسەر بیروڕاکانی من.

قسەی بیرمەندێکی بەناوبانگ هەیە دەڵێ: ڕووناکبیر ئەو کەسەیە وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە لێینەکراوە. بەڵام وەڵامەکان لەسەر ئەو دیاردە و واقیعە بن کە جێی بایەخی خەڵکن. مەبەستم نموونە هێنانەوە بەخۆم نییە بەڵام لەمەولا ئەگەر کەسانی ئاوها لە وڵاتەکەماندا هەبوون، ئەگەر پرسیاریشیان لێنەکرابوو، دیاردەی نوێیان تۆژییەوە، ورووژاندیان تا کەسانی دیکەی زاناتر منافەسەی بکەن و مناقەشە بکرێ، با پشتیوانی بکرێ تا دەنگی بگاتە هەمووان.

ئێمە هەموومان هەر لە سەرۆکی وڵاتەوە تا دەگاتە هاووڵاتییەکی سادە، هەوڵدەدەین چۆن بەڵایەکانی عێراقی ئێستا لە خۆمان دووربخەینەوە ئەویش شەڕی دینی و تایفی و سومعەی خراپی عیراقە لە جیهان. تاکو کوردستان لەرووی ئاسایش و بازرگانی و پەیوەندی دپلۆماسی، لەو سومعە خراپەی عێراقی ئەمڕۆ جیا بکەینەوە. جا مافی هەموو لایەکمانە بیر بکەینەوە چۆن دەکری باشترین حکوومەتمان



هەبێ، باشترین میکانیزم بۆ پەیوەندی نێوان حکوومەت و خەڵك بدۆزینەوە، هەر ئەوەش باشترین خزمەتە بە نیزامی دیموکراسی کوردستان.

زۆر لە ئێوە و ئەو مامۆستایانەی زانکۆ نووسیویانە، باسیان کردوە کوردستان تەجرەبەی خۆبەڕێوەبردنی کەمە، دەوڵەت بەڕێوەبردن کارێکە دەبێ مێژوویەکی بەدواوەبێت. شتێك نییە هەر بە قسە دروست بکرێ. ئێوە ئەوانەی لەبواری زانستە مرۆییەکان دەخوێنن دەزانن هەموو بەشەکانی ئەو زانستانە بە مێژوویەکی درێژ، دوای دروستبوونی دەوڵەتان، هاتوونە کایە. ئێمە هیچ کام لەو دوو هۆکارانەمان( مێژوو، دەوڵەت) نەبووە تا هەر بە کتێب خوێندنەوە فێری دەوڵەت بەڕێوەبردنی باش بین. ئەم قسانەم بۆ پاساو هێنانەوە بۆ داودەزگا خراپ و نەزان و نەشارەزاکانی حکوومەتی کوردستان نییە. هەر کەسێك لە هەر پۆستێکدایە بەرپرسیارە لەو کەموکوڕیانەی لە کارەکەیدا ڕوودەدات. بەڵام پێویستە دان بەوەدابێنین کە ئێمە حکوومەتێکمان هەیە تەمەنی پانزدە ساڵە، دە ساڵی لەو تەمەنە کورتەدا لە شەڕی ناوخۆ و تەنگوچەڵەمەدا بەسەربردووە. سیانزدە ساڵ لەو تەمەنەی لە گەمارۆی نێودەوڵەتی و حکومەتی عێڕاق دابووە. هەمووی دوو ساڵە بەپێی دەستوری عێڕاق ئیعتراف بە کوردستان کراوە. دەشزانن بە درێژایی مێژووی عێڕاق، هێندەی ئێستا شپرزە و بێ سومعە و مەکۆی تیرۆر نەبووە. ئەوانە گشتیان بوونەتە گرفتی گەورە بۆ حکوومەتی کوردستان.

ئەگەر دڵنیاین لە هونەری حکوومەتداریدا کەموکوڕیمان هەیە، پێویستە پرسیار لە خۆمان بکەین ئەوانە لە کوێوە دێن؟ لەو کەسانەدایە کە تەنیا حکوومەت بەڕێوەدەبەن؟ خۆ ئەو کەسانە زۆر گۆڕدران. ئایا بۆ کۆمەڵگاکەمان دەگەڕێتەوە کە قەت سەربەخۆ نەبووە، بۆیە خاوەن دەوڵەتیش نەبووە، دامودەزگای پەروەردە و پێگەیەنەری کادری حکوومەتی نەبووە و ئێستاش نییەتی، ئایا لە خودی کۆمەڵگاشدا کەموکوڕی نییە؟





پێموایە پێویستە جورئەتمان هەبێت دوای ئاشکرا کردنی کەموکوڕییەکانی حکوومەت، بانگ بدەین: حکوومەتێکی باشمان نابێ ئەگەر چاکسازییەکی کۆمەڵایەتی جدی دەستپێنەکەین. چاکسازی کۆمەڵایەتی لە چاکسازی کردن لە ناو حکوومەتدا، زۆر سەختترە. چاکسازیکردن لە حکوومەتدا بە بڕیاری کارگێڕی و ئیرادە و هێزی سیاسی دەکرێ، بۆیە ئەگەر بیانەوێ بیکەن کاری شەو رۆژێکە. رەخنەگرتن لە سەرۆك و وەزیر و بەرێوەبەرێك لە هەبوونی ئازادیدا کارێکی قورس نییە. ئەو سەرۆك و وەزیر و ئەندام پەرلەمانە تا دەگاتە سادەترین هاونیشتمانی، ئەگەر بەرگەی رەخنەگرتن ناگرێ، دەبێ بزانێ لە نیزامی دیموکراسیدا جێی نابێتەوە. ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دیموکڕاسی. لەم روانگایەوە بوو کە سەرۆك بارزانی لە کۆبوونەوەی لەگەڵ بەڕێوەبەری میدیاکانی کوردستان گووتی: ئەگەر هەمووتان هەموو رۆژێ قسەی ناشیرینیشم پێبلێن، لەسەر خۆم لێتانناپێچمەوە. کەواتە ئامادەیی سیاسی بۆ قبوڵ کردنی رەخنە هەیە. هەر چەند پێموایە ئەگەر یەکێك پێشێلی مافە مەعنەویەکانی سەرۆکی وڵات و سەرۆکی حکوومەت و پۆستە مادی و مەعنەویەکانی دیکەی سەروەری(سیادی) بکات، ئەوە سیستەمی دادوەری (قەزایی) دەبێ دیفاعیان لێبکات.

رەخنەگرتن لە کۆمەڵگا جورئەت و زانایی دەوێ. ئەوەش مانای جنێودان بە کۆمەڵگا نییە، بەڵکو دۆزینەوەی کەموکوڕییە لە کەلتوری کۆمەڵگا. ئێوە خوێندکارن و دەزانن کەلتور تەنیا بریتی نییە لە شیعر و چیرۆك و رۆمان واتە ئەدەب، کە هەموویان لە جانتایەکی گەورەدا جێگایان دەبێتەوە (چونکە لەوێشدا هەژارین). ئەگەر هەر ئەوەندە بوایە، گۆڕانکاری کارێکی ئاسان دەبوو. ئەوەی من دەیڵێم رەخنەگرتنە لە وردەکارییەکانی ئەو باوەڕ و داب و نەرێتانەی رۆژانە پێی دەژین، لە ناو ماڵ، لە پەیوەندی نێوان دایك و باوك و کور و کچ، لە دراوسێیەتیدا، روانگاکانمان بۆ بەڕێوەبردن، کارکردن، هەروەها بەشێکی هەرەزۆری پێکهاتەی کەلتور و دینەکەمانە. کەواتە ئەویش دەبێ توانایی خۆ گونجاندن و خۆچاککردنی هەبێ. لە



دنیادا دەوڵەتێك نییە پێش چاکسازی کۆمەڵایەتی بووبێتە دەوڵەتێکی هاوچەرخی زۆر باش. کاتێك چاکسازی کۆمەڵایەتی دەستپێدەکات و دین خۆی لەگەڵ دەگونجێنێ، ئەوەیە رێگە لەبەردەم توانایيە نۆێیەکان دەکاتەوە، ئازادییەکان فراوانتر دەبن، ئینجا حکوومەتێکی رێکوپێکتر دێتەوجود.

دەمەوێ بزانن من زۆر پشتیوانی حکوومەتی کوردستانم و پێویستە هەموو هاووڵاتیان شانازی بەو سەروەرییە بکەن کە هەیانە. سەروەریمان لەو حکوومەتەدا دەردەکەوێ کە هەمانە. ئەویش پەسندکراوی ئەو پەرلەمانەیە کە هەڵمانبژاردووە. ئەگەر سەروەری مایەی شانازی میللەتان بێت، دەبێ ئێمە ئەوانەی ئێستا لێرە دانیشتووین، تێر تێر شانازی بەو حکوومەت و سیستەمەوە بکەین کە هەمانە. بە بارستایی ئەو شانازییەش دەبێ ئامادەییمان تێدابێت رەخنە لە دامودەزگاکانی حکوومەت و سیستەمی کۆمەڵایەتیمان بگرین. ئەم حکوومەتە بەرهەمە تێکۆشانی گەل و خوێنی شەهیدەکانییە تی. دەپرسم: ئایا حکوومەت هەر لەخۆیەوە چاك دەبێ؟ دڵنیام نا. راگەیاندن و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بە چەشنە جیاجیاکانیانەوە، رۆلی سەرەکیان هەیە لە گەیاندنی راو بۆچوون و خواستەکانی خەڵك بە حکوومەت، هەروەها هێنانەوەی وەڵام و ئاستەنگ و کەموکوریەکانی حکوومەت بۆ خەڵك. رۆلی ئەم دووانە (راگەیاندن و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی) لەوە تێناپەڕێت. لە هەموو وڵاتانی پێشکەوتوودا راگەیاندن بەمانای جنێودان نییە، ئەو رەفتارە بە پێشێل کردنی ماف دادەندرێ، بۆیە رۆژنامەنووس و خاوەن دەزگاکانی میدیا دەکەونە بەر لێپێچانەوەی یاسایی، ئەگەر لە جیاتی پەیام ( جا چ سیاسی، هەواڵ، بیرورا، پرۆژە..بێت) توندوتیژی بگوازێتەوە. لە یاسای نێودەلەتیدا توندوتیژی لە کاری راگەیاندنیشدا قەدەغەیە. هەربۆیە کە سنوری خۆیان بەزاند پێشیان پێدەگیرێ.

ئێمە تەجرەبەیەکی کەممان لە کاری راگەیاندندا هەیە. هەر چەند لە بواری نووسین و بیستندا بەشێکی کاری تێکۆشانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان بووە. دوای

راپەرین ئەو شۆڕشە (پازدان) گەورەی لە تکنۆلۆژیای راگەیاندن روویدا، ئێمەش ئەم دواییە وەك هەموو دنیا لێی بەهرەمەندین، وەکو هەموو میللەتان دەنگمان بە خێرایی دەگاتە هەموو جیهان. ئایا ئامادەکردنی کادری راگەیاندن و دروستکردنی روانگای هاوچەرخی گونجاو لەگەڵ پێویستییەکانی گۆڕانکاری کاریان بۆ کراوە؟ نا، نەکراوە. بۆیە دەبینین خەڵك گلەییان لە ئاستی بەرهەمی راگەیاندن هەیە و لەگەڵ راگەیاندنی پێشکەوتوو بەراوردی دەکەن. بەڵام خۆ کادری راگەیاندن لەناو ماڵ فێری ئەو پیشە هاوچەرخە نابێ. لە هەموو بوارەکانیدا دەبی بخوێنی، ئینجا رادەهێندری، جا حەزی لێیە لە کام کاناڵ بۆ کام مەبەست و لە چ بواردا ئیش بکات؟ بۆ نموونە حەزی لێیە لە کاناڵێکی سیاسی بێت یان لە یەکێکی کۆمەڵایەتی، لە هونەردابێت یان پەروەردەیی، لەوێدا پەیامنێر بێ یان نووسەر، لێکۆلەرەوە بێت یات پێشکەشکار، چاودێری زمان بێ یان وێنەگر؟ وە..پێداوەرە. ئەو بوارانە هەموویان گرنگن و پێویستە بۆیان بخوێنن و ئامادە بکرێن. ئێمە ئەوانەمان هیچی نییە. کەسەکان لەناو ماڵەوە هاتوون حەزیان لێیە ببنە رۆژنامەنووس. کەلتوری ناو ماڵ، گەڕەك، شار لە زمان و نووسین و قسەکردن و بەکارهێنانی گفتوگۆ دەگوازێتەوە بۆ دەزگاکانی راگەیاندن. بۆیە قسەی سوك و پێشیل کردنی ماف دەکات و هەستی پێناکات. هەندێکیش پەیدابوونە پێیانوایە دەبی قسەی سوك و بوختان بە هاووڵاتیان بکەن تا بناسرێن. کەچی لە کاری راگەیاندندا ئەمە تاوانە. چەند مەترسییەکی دیکەش لەگەڵ خۆی دێنی چونکە نابێتە مایەی چاکسازی. بۆ نموونە وەزیرێکی نەزان یان گەندەڵ یان سەرنەکەوتوو یان نامناسبی پلەکەی لەبەرچاو بگرن. رۆژنامەنووس یان ئەو گروپەی تەمای وایە رەخنەی لێبگرێت، دەبێ زۆر خۆی ماندو بکات و بەدوای کارەکە بکەوێ، بەڵگە بەدەستبێنێ و شیبکاتەوە، پێویستە لە سنوری یاسادا بجولێتەوە. وەزیریش مافەکانی هاووڵاتیبوونی هەر دەمێنێ. بۆ نموونە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی دوو سەرۆکی دوو حکوومەتن لە پێکهاتەی عێراقدا، بەڵام وەك ئێمە ناسنامەی مەدەنییان (هەویەی ئەحوالی مەدەنی) هەیە و هاووڵاتین، کە ئەو



پۆستانەیان پێسپێردراوە لەبریدا مافی هاووڵاتییان لێوەرنەگیراوەتەوە. وەزیر و بەرێوەبەرەکانیش هەروان. کاتێك رەخنەیان لێدەگیرێ، دەبێ لایەنی یاسایی و مافەکانی مرۆڤ رەچاو بکرێن. بەم شێوازە پێیدەلێی: کاکی من ئەوە کەموکورییەکانتە. سەرۆکی حکوومەت ئەمە کەموکوڕی کابینەکەتە، سەرۆکی وڵات ئەمە کەلەبەرەکانی سیستەمەکەتە. ئەو جۆرە رۆژنامەنووسانەن دەست بە وەزیر لەکار دەکێشنەوە بەڵام نەك بە شەڕەجنێو.

رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، پێکهاتەیەکی نوێی سیستەمی دیموکراسین، ئەویش دیموکراسی هاوچەرخ نەك کلاسیك. ئەوانیش هەندێکیان وەك راگەیاندن، خەریکە کاری خۆیان بە چەوتی تێدەگەن. کاری ئەوان هاندانی خەڵك بۆ توندوتیژی و خۆپیشاندان و پەلاماردان و تیرۆر نییە، بەڵکو پردی پەیوەندین لە نێوان حکوومەت و ئەو هاووڵاتیانەی مافیان پێشێل دەکرێ، وەك پێڕانەگەیشتنی حکوومەت، خراپیەکانی بیرۆکراسی، ئەگەر لایەنگیریی سیاسی بووبێتە هۆی فەرق و جیاوازی گەیاندنی خزمەتگوزاری بۆ تاك یان ناوچەیەك. هەندێکیشیان کاری رۆشنگەری دەکەن. ئەی ئەگەر رێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی بلندگۆی بەدەستەوە بوو بۆ هاندانی خەڵك تا پەلاماری ئەم و ئەو بدەن؟ ئەمە رێك ئەو عەقلیەتەیە کە یەکێك جنێو دەدات و دەلێ من رۆژنامەنووسم حەقمە ئەم کارە بکەم، هەر بە گوێ لێبوون راپۆرت دروست دەکات و هەلوێستیش وەردەگرێ و بێ لایەنیی ناپارێزێ، حەیای هاووڵاتیان دەباو بەرژەوەندی دەخاتە مەترسی، دوایی دێت داوای لێبوردن دەکات گوایە نەیزانیوە. ئەرێ لە وڵاتانی پێشکەوتوودا شتی ئاوها هەیە؟ ئەم دیاردەیە لە کەلتوری کوردستانیشدا نییە. لە چەند ساڵی رابردودا تەنیا گروپە ئیسلامیە توندڕۆیەکان لە رۆژاوا، دەرفەتەکانی یاسایی کۆمەڵگای مەدەنییان بۆ کاری تیرۆڕ بەکارهێنا. لە ئەنجامدا هەر بە یاسا رێگایان لێگیرا.

با نموونەیەکتان بۆ بگێرمەوە. حکوومەتی ئیسلامی ئێران کەیفی بە ئەمریکا نایەت، بۆیە فلیمی سەیرو سەمەرە لەسەر کەلتوری ئەمریکا دروست دەکەن. لە





تەلەفزیۆنی ئێراندا لاسایی فلیمێکی کاوبۆیان دەکردەوە،بەم چەشنە: کاوبۆیەك دێتە ناو گازینۆیەکی قەرەباڵغ و بە ئیشارەت لە خاوەن گازینۆیەکە دەپرسێت: ئەرێ ئەو کابرایەی بنەبان ناوی چیە؟

خاوەن: کامەیان؟

کاوبۆ: ها هۆوەی فلان کورسی

خاوەن: تێناگەم کامەیانت گەرەکە!

کابرای کاوبۆ دەمانچەکەی هەڵکێشا و سێرەی لێگرت و تەپەی لێوەهێنا.

خاوەن: ها. جا تازە ناوت بۆ چیە؟ کوشتت.

ڕۆژنامەنووسەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی نابێ ئەو دەمانچەیە بەکاربێنن. بۆ گفتوگۆ پێویستە سنگیان بەقەد سنگی پاڵەوانی ئەفسانەیی ئێران ئارەشی کەمانگیر فراوان بێت(*). ئەگەر یەکێك قسەیەك یان پێشنیارێکی کرد، ڕەخنەیەکی گرت، نەك جارێك بەڵکو چەند جار داوای لێبکەین بۆمان ڕوونبکاتەوە

* لە ئەفسانە مێژووییەکانی ئێراندا ئارەش ئەو نیشتمانپەروەرەیە کاتێك وڵاتەکەی داگیرکرا پێیان گووت سنوری وڵاتەکەت هێندەی مەودای هاویشتنی تیرێك دەمێنێ. ئارەش تیروکەمانەکی هەڵگرت، ئێرانییەکان دڵیان لە چنگی ئارەشدابوو چونکە پانتایی نیشتمانی بۆ دیاریدەکرد. ئارەش دەیویست تیرەکەی تا ئەوسەری سنوری ڕاستەقینەی ئێران بڕوات، بۆیەی هێندە بەتاو تیرەکەی ڕاکێشا کە گیانی لەگەڵ دەرچوو.

مەبەستی چییە؟ چونکە ئامانج ناوەرۆکی پەیامەکەیە.

ئەی ئەگەر لە سەنگەر دانیشن و وشەیەك بقۆزنەوە یان هەڵیگێڕنەوە یان بەپێچەوانەوە لێکیبدەنەوە؟ ئەوکات کارەکە لەگەڵ کەمین دانانەوەی تیرۆریستان فەرقی چیە؟ ئێرانییە کان بە شەهامەتترین کەس بە ئارەش دەشوبهێنن، پێویستە ڕۆژنامەنووس و چاکسازی مەدەنی ڕوحیەت و شەهامەتی ئارەشی کەمانگیری هەبێت.



قسەیەك دەکەم، حەز دەکەن باوەڕ بکەن، حەزیشتان نەکرد، پێشەکی باوەڕ مەکەن: من تۆزقاڵێك بەو هەڵڵا و جنێو و بوختانانە تەنگاو نیم. دەزانن بۆ؟ چونکە هیچ کاریگەری بەسەر واقیعی کۆمەڵایەتی کوردستانەوە نابێ. خۆ ڕاگەیاندن ناکەینە باڕی جوامێرە (الفتوة) کۆنەکانی بەغدا. دەگێڕنەوە، ئەوانەی بۆ مەشروب خواردنەوە دەچوونە ئەوێ، دوای سەرخۆش بوون بە بوتڵ و دۆلکە لە سەروپۆتەڵاکی یەکتریان دەدا. خاوەنەکەی ناچار بوو مێزەکانی کردە پلێت، بە بورغی بە کەفی هۆڵەکەوە بەستنی، پەرداخ و قاپەکانیشی کردە چینکۆ و بە زنجیر بە مێزەکانەوە بەستنییە وە. شەراب و مەزەیان بە سەتڵ بەسەر میوانەکاندا دەگێرا! دەبێ شەهامەتی ئەوەمان هەبێ بڵێین ئێمە لەو بەناو جوامێرانە نین. وشەی شەهامەت مانای وێران و نەترسان و قسەکردنە چونکە یاسایەك هەیە دەتپارێزێ. لێکحاڵیبوون هونەرە و پێش ئەویش زانستە. ئێمە دەبێ شێوازی گۆڕانکاری گونجاوی کەلتوری خۆمان کە دەمانەوی گۆڕانی تێدا بکەین، بدۆزینەوە. دەبێ بخوێنین و تەجرەبەی وڵاتانی پێشکەوتوو دیراسە بکەین. زۆر بە متلەقی دەڵێم مرۆڤی هاوچەرخ نابێ بە ڕای مخالیف سەغڵەت بێت و هەڵبچێت، ئەگەر کولاندت دەبێ خۆت بگری، دوایی بە مەنتق بکەویتە بەرەنگاری.

ئەو ئامانجانەی باسمکردن بە ئاسانی نایەنەدی چونکە پاشماوەی کێشەی سیاسی هەر ماوە و ئاستەنگێکی چەتونە. یەکێتی نیشتمانی و پارتی هاووڵات کە تا چەند ساڵ لەوەوبەر شەڕی یەکدییان دەکرد، ئێستا هاوپەیمانن. پەرلەمان و حکوومەتی کوردستان پێکەوە بەڕێوەدەبەن و بە یەك ئەندازەش لە کەموکوڕییەکان بەرپرسیارن. جا کورد تەنیا خۆیان بەڕێوەنابەن، لە بەڕێوەبردنی بەغداش بەشدارن. لەوێش بەقەد یەکتر بەرپرسیارن. بەڵام هەر یەکەیان لە پۆستی خۆیدا بەرپرسیارە. لێرەدا پێتانوانەبێ هەموو کەس حەزی لە بەرەوپێشەوەچوونی ئەم پرۆسەیەیە. ناحەزەکان ئەمانەن:١- هەندێك کەسایەتی سیاسی ٢- هەندێك دەوڵەت ٣- چەند ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی پاشکەوتووی خەتەرناك. ئەوانە چاوەڕوان بوون ئەنجومەنی وەزیرانی حکوومەتی کوردستان کاری وەك ئەوەی بەغدا بێت کە باسمکرد، وەزیرەکان





نەتوانن کۆببنەوە و هەر خەریکی هەڵڵا نانەوە بن. چاوەڕوانیان نەدەکرد هونەری بەڕێوەبردنی حکوومەتی دوای شەڕی ناوخۆ و شەڕی ساردی دە ساڵە، بەو جۆرە بێت کە هێمنترین و شارستانیترین و پڕکارترین شوێنی حکوومەتەکە ئەنجومەنی وەزیران و دەزگاکانی بێت! ئەوە هیچ پێیان نەهێشتەوە تەنیا ئەوە نەبێ کە بە سەرۆکی حکوومەت بلێین: نێچیرڤان بارزانی دەستت خۆش بێت. هەردوو حزب پشتیوانی دەکەن. هەڵبەت کەسانێك هەن لەوە پەستن و بەرژەوەندیان لەو پێشکەوتنەدا نییە بۆیە نایانەوێ ئاو لەو ئاشە بکەن. ئەوانە هەوڵدەدەن ئەم پرۆسەی لێکحاڵیبوونە بوەستێت. بۆیە وتاری ژەهراوی بڵاودەکەنەوە، وشەیەك دەقۆزنەوە، چونکە هەموو کارەساتەکانی مێژوو لەو کوشتنی کەسێك یان ڕووداوێکی لەناکاو دەستپێدەکات. ئەگەر یەکێك هەموو وڵاتەکەی بەلاوە گرنگ نەبێ، گفتوگۆ و لێحاڵیبوونی بەلاوە قەت گرنگ و پیرۆز نابێ. گرنگ ئەوەیە رۆژنامەنووسە گەنجەکان کە وڵاتی خۆیان خۆشدەوێ و بۆ پێشکەوتنی کار دەکەن، نەکەونە ئەو داوانەوە. جا ئەو داوە با داوی سەرۆ قادر بێ و ناوی کەسی دیکە ناهێنم.

هەر هاووڵاتییەك بە رێگی قانون دیفاع لە رای خۆی بکات، تەنانەت ئەگەر رایەکەی زۆر چەوتیش بێت، ئینجا بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی، لەو کەسانە کاریگەرترە کەوا بڵندگۆئاسا هەر دەنگ نەقلْ دەکەن. چونکە بەلانی کەمەوە هاووڵاتی یاساپارێز دەبێتە مایەی گفتوگۆ و لێکحاڵیبوون. ئەوەشیان بەردەوامی و سەبری دەوێ. هیچ میللەتێك بە تاکە مناقەشەیەك و رایەك پێشنەکەوتووە. ئەگەر کار هێندە ئاسان بایە، بەو تکنۆلۆژیا بەرفراوانەی لە دەستماندایە، ئەوە بە رۆژێك میللەتەکەمان دەگەیاندە قۆناغێکی باڵا. چ میللەتێك وا بە ئاسانی قورتاری بووە تا ئێمەش لاسایی بکەینەوە؟ بۆیە پێویستە پشووی گفتووگۆمان بۆ چەند ساڵ بێت. ئەمە کاری رۆژان و مانگان نییە، بەڵام بۆ ئەوەش نییە پاساو بۆ وەستان بێنینەوە و کەموکوڕییەکان چاك نەکرێن و شوێنەواری چاکسازی نەبینین و بەوە خۆمان رازی



بکەین کە میللەتان مێژوویەکی دوورودرێژیان بڕیوە تا خۆیان چاك کردوە و حکوومەتێکی باشیان دروست کردووە!

ئێمە ئامانجمان لە رەخنەگرتن تەنیا بۆ چاکسازی سیاسی نەبووە. بۆ؟ چونکە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان لە ماوەی سەد ساڵ تێکۆشاندا، بە پێچەوانەی سەمتی وڵاتانی داگیرکار، لە پێناوی ئەم ئامانجانە رۆشەنگەری کردووە: ١- لەپێناوی رزگاریی نیشتمان ٢- لە پێناوی ئازادی ٣- بۆ هێنانەدی دیموکراسی و یەکسانی. ئەم چەمکانە وەك چەمکەکانی عیبادەتی ئاینی لەناو ئاگایی و هوشیاری میللەتەکەماندا چێندراوە، بەڵام تەجرەبەی نەبووە. هەر وەك چۆن بەهەشت و دۆزەخ لە باوەڕی ئاینیدا هەنە، بە هەمان شێوە ئەو چەمکانەی سەرەوە کاریان لە ناو ئاگایی کۆمەڵگای کوردستاندا بۆ کراوە. دیموکراسی پێویستە دروست بکرێ، بەڵام زەمانی دەوێ و کاری چەند نەوەیەکی گەرەکە، بۆیە پێویستە نەوەکان توانایی گفتوگۆ کردنیان هەبێت. ئەو کۆمەڵگایەی چاکسازی قبولْ ناکات، پێمنالێی مافەکانی گەنج چۆن دەپارێزرێ؟ منیش وەك ئێوە چەند ساڵە لە تەلەفزیۆنەکاندا تەماشای بەرنامە تایبەتیەکانی گەنجان دەکەم کە هەمووی لەوەدا کۆدەکەنەوە کە بۆ نایەڵن قۆڵیان رووت بکەن و قژیان درێژ بکەن!

پێویستە بەشێوەیەکی دیکە ئەم گرفتە گەڵاڵە بکەین ئەویش ئەو قەناعەتە دروست بکەین کەوا بایەخی مرۆڤایەتی بزاندرێ و بەشەر جارێك دەرفەتی ژیانی هەیە و لە چوارچێوەی یاسادا بۆی هەبێ بە قەناعەتی خۆی بژیەت. ئەگینا گرفتەکە لە کورت و درێژی قۆڵ و قژدا نییە. پێویستە دان بە هاووڵاتیەتی یەکدیدا بێنین. لە کۆمەڵگایەکدا تێزاب بە قاچی رووتی ئافرەتدا دەکەن و هۆپی بۆ دەکێشن، دەتەوێ گەندەڵی نەبێ؟ ئەو کەسەی تێزاب بەکاردینێ و دەنگ بۆ هەڵبژاردنەکان دەفرۆشێ، ئەو کەسەی کێشەیەکی نەخوێندۆتەوەو داوای دادگایی کردن دەکات، ئەو کەسەی نەیدیتووە و نەیبیستووە بەڵام لەسەر بیروڕا یەکێك دەکوژێت، ئەگەر بکرێتە وەزیر و بەڕێوەبەر چ گەندەڵێکی لێدەردەچێ؟ ئەری جورئەتی ئەوە بەخۆمان دەدەین بەم





چەشنە مناقەشەی کۆمەڵایەتی بکەین و ڕەخنەی لێبگرین؟ ئێوە دەزان ئەو دوو کەسەی کە قابیل و شاپوریان تیرۆر کردن، ( ئەو دوو قوربانییە نە لە حزبی من بوون و نە دەیانناسم، نە ڕۆژێك لە ڕۆژان دیتوونم) دوای چەند مانگ گیران و ئیعترافەکەیان لە تەلەفزیۆن بلاوکرایەوە، گووتیان ئێمە بیستمان کە ئەوانە کوفریان کردووە، هەردووکمان برادەرین و تەلەفۆنمان بۆ یەکدی کرد و سواری تاکسی بوین و گەردی بەیانی لێیان بەژوورکەوتین، ئەوەی لەوێ بوو بێ لێوردبوونەوە کوشتمانن. ئەو دوو گەنجە نەزان و توندڕۆیانە فتوای خوێن حەڵاڵکرانی چەند چالاکێکی بواری مافەکانی ئافرەتیان لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆی یەکێك لە حزبەکان بیستبوو. ئەوە بە ئەرشیف لای من هەیە. ئەرێ جورئەتی ئەوەمان هەیە دژی ئەم کەلتورە بوەستین یان نا؟

گوێتان لە پەیامی نەورۆزی سەرۆکی حکوومەتی کوردستان بوو کە سەبارەت بە کار نەکردنی هاووڵاتیان چی گووت؟ لە توێی ئەو پەیامەیدا دەیەوێ بڵێ وڵاتتان هەیە، ئازادی هەیە، سامانێکی نیشتمانی زۆرتان هەیە، حکوومەتێکتان هەیە کە پێوەیە کەموکوڕییەکانی خۆی چاك بکات، تکادەکەم: ١- هاوکاریمان بکەن تا دەست بە چاکسازی خۆمان بکەین تا گەندەڵی تێدا نەمێنێ و شەفاف بێ ٢- وەرن کار بکەن. میللەت نابێ هەمووی بێ کارکردن داوای موچە بکات.

هەموومان مافی خۆمانە سەرمایەی وڵات بە هی خۆمان بزانین بەڵام بەکام ڕێگا کەڵکی لێوەربگرین؟ پرسیار ئەوەیە: کار دەکەین یان نایکەین؟ کی هەیە سەردان و سکالای بۆ لای ئەو وەزیرو گزیرانە نەبردبێ تا لە معاشێکەوە بیکات بە چەندی دیکە؟ خۆ ئەوانە وەزیر نین هاووڵاتین، ئەو سیفەتە کەلتوورییە، ئەرێ گەندەڵییە یان نا؟ ئامادەییمان هەیە ڕەخنە لەو دیاردە بەرفراوانە بگرین یان نا؟ چاکسازی کۆمەڵایەتی ئاوها دەستپێدەکات. لەم پرۆسەیەدا هەموو دامودەزگا ڕۆشنبیری و زانستی و ڕاگەیاندنەکان ئەرکیان لەسەر شانە لە ڕەگ و ڕیشەی ئەو کەلتورە بکۆڵنەوە تا بزانن چون چارەسەری دەکەن.



پێویستە لە زانکۆکانی کوردستانیشدا چاکسازی بکرێ. دوو ڕۆژ پێش ئێستا قوتابیەکی پەیمانگایەك تەلەفۆنی بۆ من کرد گووتی ئێستا مامۆستایەك منی لە محازەرە دەرکرد و هەڕەشەی دەرکردنی یەکجارەکیشی لێکردم چونکە کاتێك لەناو دەرسدا گووتی هەر کە ناوی سەرۆ قادرتان بیست وێنەی سەگ بەرز بکەنەوە. منیش مناقەشەم کرد کە سەرۆ مەسەلەکەی بەو جۆرە باس نەکردووە. کەچی مامۆستا پێی گووتم هەستە بڕۆ دەرەوە. ئەم جۆرە پەیوەندیە هەڵەیە و ئەوەش گفتوگۆ نییە. جا ئەگەر لە زانکۆ حاڵ ئاوها بڕوات، لە ناو گەرەکەکان چۆن دەبێ؟ مەبەستم خۆم نییە بەڵام با هەر لە ئێستاوە پەرژین بۆ ئازادی ڕادەربڕینی خەڵکی دیکە دروست نەکەین، با بە بڵندگۆ هانی توندوتیژیی نەدرێ، ئەویش کێ؟ خوێندکار! بە هاندانی کێ؟ ئەو مامۆستایانەی سیاسەتی تۆقاندن بلاودەکەنەوە! ئەوە لە کۆمەڵگایەکدا دەکەن کە توندوتیژیی پانتاییەکی زۆری مێژووەکەی پێکدێنێ.

ڕاگەیاندن و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستە ئەو شێوازانە پەیرەو بکەن، ئەگینا ناتوانن پردی گفتوگۆ لەنێوان دوو نەوە، نەوەی نوێ و نەوەی فەرمانرەوا دروست بکەن. تا چاکسازی دەستپێنەکات، ئازادی بۆ گەنجان دەستەبەر نابی و جوان پێناگەن.

ئێمە کێشەی زمانیشمان هەیە. ئەگەر شانازیمان ئەوەبێ کە شاخەکان و زمانەکەمان بوونی میللەتەکەمانی پاراستوە، لە سەردەمی ڕزگاری و ئازادیدا، ئەو زمانەی لە ڕاگەیاندن و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بەکاردێندرێ، هی ئەم سەردەمە نییە چونکە نە زمانی پێشوو دەوڵەمەندتر دەکات و نە پەیامێکی پێدەگەیەندرێ. بۆیە چاکسازی لەوێشداپێویستە ئەگینا ناتوانێ ببێتە ئامرازێکی باش بۆ گەیاندنی پەیام و زانیارییەکانی ئەم سەردەمە. ئەو کەسەی ڕای جوانی پێیە با خۆی فێر بکات پەیڤ و وشەی دەوڵەمەند و مانادار بەکاربێنێ. ئەگینا جیا لە دروستکردنی هەڕەشە لەسەر سەلامەتیی کۆمەڵایەتی،بەردەوامی زمانەکەش دەخاتە مەترسییەوە.





ڕۆشنبیریی پەنابردن بۆ یاسا پێشینەیەکی نییە بۆیە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارگێڕیی دروست کردووە. بە نووسین و گوفتار و کردار ئەوەندە بە توندی ڕەفتار لەگەڵ یەکدی دەکەین ڕێك وەك ئەو تۆپ و کاتیۆشایانەی ڕژێمی بەعس لە شار و گوندەکانی خۆمانی دەگرت. ئەوە وای لێهاتووە پەنابردن بۆ یاسا ببێتە عەیب، کەچی یەکێك لە سیفەتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و هاووڵاتە، مافخوراو بە دەستی خۆی بیر لە تۆڵەسەندنەوە ناکاتەوە، پەنا بۆ یاسا دەبات و شکایەت دەکات. شکایەتکردن بێ دەسەڵاتی نییە بەڵکو شەهامەتێکی زۆر گەورەیە کە ئێمە ممارەسەی ناکەین. ئەو کەسەی شکایەت ناکات، ئەو ڕێزی یاسا ناگرێت، کەواتە یاسای بۆ چییە؟ ئەگەر کار گەیشتە ئەوە ئیدی چ چاوەڕوانییەکمان لە بەرهەمەکانی دیموکڕاسی و نەبوونی گەندەڵی و پەرەپێدانی شەفافیەت هەیە؟ ئالێرەدایە ڕەخنە لە کۆمەڵگا دەگرین.

ئەو ڕاستیە لایەکی دیکەشی هەیە، ئەویش کەموکوڕییەکانی حکوومەتە. ئەگەر کاری دەزگاکانی ئاسایش بەلاوە بنێین کە سەلامەتی و ئەمنیەتی وڵاتیان دابینکردووەو من یەکەو باری خۆم ستایشیان دەکەم، ئەوانە پێشمەرگەی شاراوەن و جێگای ڕێزن. کەچی بە پێچەوانەوە دامودەزگاکانی پۆلیس بە چەشنێکی ئەوتۆ ڕاهاتوون کە بەبەرچاویانەوە خەڵك سەرو ملی یەکدی بشکێنن، جولە ناکەن و پێشیان پێناگرن. ئەو هاووڵاتیەی شکایەت بکات، بنی پێی دەسوێ هەندی بێت و بچێ تا شکایەتەکەی لێوەردەگرن، کە وەریشیانگرت بەدوایدا ناچن! دەیهێڵنەوەو خاوەخاوەی پێدەکەن. زۆربەی تاوانەکان لەو گنخاندنەوە دێن کە پۆلیس بە دەستوبردی کاری کۆنترۆڵ پەیرەو ناکات. کەچی لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا ئەو کەسەی شکایەتی لێدەکرێ زوو لێی دەپێچرێتەوە و لێی دەکۆڵنەوە، ئەگەر تاوانکار دەرچوو ئەوە یاسا بڕیاری خۆی دەدات، ئەگەر تۆمەتبارکراو پاك دەرچوو ئەوجا ئەو کەسە سزا وەردەگرێ کە بوختانی بە یەکێکی دیکە کردووە. جا با سەد نموونەی هەردووك لایەن لە وڵاتدا هەبن بەسە بۆ ئەوەی خەڵك بزانن چۆن پەنا بۆ یاسا بەرن و چۆنیش نەتوانن



بەکاری بێنن. لێرەدا کاری حکوومەتە تا لە ڕێگی دەزگاکانی پۆلیسەوە١- لادەر یان تاوانبار بگرێ ٢- زوو بیداتە دەست سیستەمی دادگا تا خێرا ڕەوا و ناڕەوا دیاری بکات.

سیستەمی دادگایی ئێمەش دەکەونەبەر ڕەخنەگرتن. ئەو سیستەمە دەڵێی تەنیا بۆ ژن مارەکردن و تەڵاقدان و تاپۆکردنی زەوی و زار دانراوە. هەروەها ئەگەر کوشتارێك ڕوویدابێت ئامۆژگاری هەردوولایان دەکەن بچن بە سوڵحی عەشایری چارەسەری بکەن!

جاری وا هەیە هاووڵاتی خۆی دەیەوێ فایلەکەی لەو فەرمانگا بۆ ئەویدی بەرێت چونکە پۆلیس ناجولێت و هاوکاری خاوەن فایلیش قبوڵ ناکات. ئینجا کە گەیشتە دادوەر هێندەی تاخیر دەکات تا شکایەتکار بێزار دەبێ و بڕوای بە عەدالەتی حکوومەت لە هەردوو بواری پۆلیس و دادگا نامێنی و لەوانەیە پەنا بۆ تۆڵکردنەوە و ڕەفتاری شەخسی بەرێت. ئا لێرەدایە ئاژاوە و پاشکەوتوویی دەژێتەوە. بۆیە چاکسازی بەو مانایە نییە کە تەنیا لەناو کۆمەڵگا و لە دەرەوەی حکوومەت دەست پێبکات بەڵکو دەبێ لەو بوارانەی ئاماژەم پێکردن زۆر بەخێرایی بیری لێبکرێتەوە. پرسیاری من ئەوەیە: پۆلیس دەگاتە سەر هەموو تاوانەکان؟ دادگاکانمان لە هەموویان دەکۆڵێتەوە؟ ئەرێ حوکمی عادل لەسەر هەموویان دەدات؟

ئەگەر تاوانکار زوو شکایەتی لێبکری و پۆلیس زوو بیگرێت و دادگا زووتر بڕیاری لەسەر بدات، ئەوە باشترین هاوکاری بۆ ئەو و کۆمەڵگا کراوە چونکە لە تۆڵە لێکردنەوە دەیپارێزێ و دادگاکان بە چاپوکییان لەو کردەوەیەدا پێش ئەوەی مافی ستەملێکراو بگێڕنەوە، خزمەتی تاوانکاریان کردووە تا جیا لە چاککردنی، لە دەست هەڕەشەی تاوانلێکراو دەیپارێزن. ئەوانە هەموویان پێویستن. ئەگەر ئاوها نەکرێت ئەوە لە کۆمەڵگای پاشکەوتوودا هەزارو یەك ڕێگاو پاساو بۆ تۆڵەسەندنەوە و پیلانگێڕان و بوختان و فرت و فێڵی دیکە هەیە.





گرفتێکی دیکەش هەیە پێویستە رەخنەی لێبگیرێت، ئەویش تەنیا هاوولاتیان نین کە بەرژەوەندییان دەکەوێتە مەترسییەوە، بەڵکو بەرژەوەندی کۆمەڵ واتە بەرژەوەندی گشتی هەیە دەکەوێتە بەردەم هەرەشە و بوختان و تیرۆر کردن. ئایا دەزگایەك هەیە بە یاسا دیفاع لە بەرژەوەندی گشتی بکات؟ بەڵێ لە سیستەمی دادگادا هەیە. ئەوانە ناویان چیە؟ پێیان دەگووترێ داواکاری گشتی. بێکارترین کەسانی ولاتی ئێمە داواکارە گشتییەکانن! لە دەرگایان بدە ئامادەنین دیفاع لە بچوکترین بەرژەوەندی ئەم ولاتە بکەن! ئەگەر ئەوانە کاری خۆیان کردبایە، ئەو هەمووو ئاژاوەیە دروست نەدەبوو. وەزیر و پەرلەمان و سەرۆکی حکوومەت و سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی ولات، هەموویان لە پۆستی خۆیاندا، ئەوە جیا لە دامودەزگا مەعنەوییە گشتییەکان، باسیان دەکرێ و زۆرجار بوختان و پیلانیان بۆ هەڵدەبەسترێ و لە راگەیاندندا بلاودەکرێتەوە. ئەرکی داواکاری گشتییە چاودێریی بکات و داوایان لەسەر ببەسترێ. لە کوردستاندا داواکاری گشتی ئەو کارانەی خۆی ناکات و بەمەش کێشەیەکی نەك هەر کۆمەڵایەتی بەڵکو کێشەی سیاسیشی لێدەکەوێتەوە. تا ئێستا چەند نموونەمان لە کێشەی دادگاییدا هەیە کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشتییەوە هەبووبێت؟ نەبوونی ئەوە بووەتە مایەی دیاردەی گەندەڵی لە حکوومەتدا. بۆ نموونە فلان وەزیر کاتێك بە ناهەق باسیدەکرێ و داواکاری گشتی دیفاع لە بەرژەوەندییەکەی ناکات، وەزیر چی بکات باشە؟ تۆڵە بکاتەوە دەڵێن پۆستەکەی بۆ توندوتیژی بەکارهێنا، وا ناکات سیستەمی دادگا نووستووەو ئەویش ئیعتباری کەوتۆتە مەترسییەوە. بۆیە دەبینی زۆر جاران وەزیر هەوڵی کڕینی رۆژنامەنووسان دەدەن تا بێ دەنگیان بکەن، لەوە زیاتر پڕۆپاگەندەشیان پێبکەن.

سەرۆکی ولات و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆکی پەرلەمان، نوێنەرایەتی سەروەریی کوردستان دەکەن کە دەیەوێ دیموکرات و مەدەنی بێت. باشە داواکاری گشتی بۆچی دیفاعیان لێناکات؟ ئەم پرسیارە لە سیستەمی دادگا دەکەم. کاتێك ئەوان کاری خۆیان ناکەن ئەوە زەبر لە نیزامی دیموکراتی نادات، گورز لە پێویستیی



گفتوگۆو لێکدی حاڵیبوون ناوەشێنێ و بەشدارنین لە نانەوەی ئەو ئاژاوەیەی کە ئێستا هەیە؟ وەلاممان پێویستە.

سیستەمی پەروەردە و زانکۆیی پێویستە مل بۆ گۆڕانکاری بنێن. گۆڕانکاری لە پڕۆگرامەوە تا کەسایەتی مامۆستاکان، بۆ ئەوەی خوێندکار بە نموونەی خۆی قبوڵیان بکات. زانکۆ و سیستەمی پەروەردەیی، لە عێراق و لەم بارودۆخەدا دروست بوون: ١- ولاتێکە بە ئاگر و ئاسن پێکەوەنراوە ٢- دەرفەتی دیموکراسی تێدا هەڵنەکەوتووە ٣- زیاتر لە سی ساڵ فاشیزم فەرمانرەوا بووە. مەترسی فاشیزمیش لەوەدایە کە سەرلەنوێ کۆمەڵگا و کەسایەتییەکانی لە قاڵب دەداتەوەو سەرلەنوێ مێژوو و بەها کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دادەرێژێتەوە. کارگەی ئەو ئامانجە لە قوتابخانەکانەوە دەستپێدەکات و بە زانکۆکان کۆتایی دێت. بۆیە چاکسازی پێویستە لەوێشدا دەستپێبکات.

ئاخرین شوێن کە دەبێ چاکسازی تیدا بکرێ خێزان و جۆری پەیوەندییەکانیەتی. کەچی لە نەزانیمان هێناومانەتە یەکەمین قۆناغی گۆڕانکاری. دایکان و باوکان کەوتونەتە بەرپەلامار نەك رەخنە. پێویستە بزانین دایکان و باوکانیش بەرهەمی ئەم نیزامە کۆمەڵایەتیەن. ئینجا زۆربەی دانیشتوانی ولاتیشمان نەخوێندەوارن. با جارێ بە قانون و قەناعەتی کۆمەڵایەتی کە هی یەك تاك نین، ئازادییەکان دابین و تۆکمە بکەین تا ئەوکاتە دایکان و باوکانیش بگۆڕێن و لێیانبپێچرێتەوە و دەسەلاتیان بۆ بەرژەوەندی و بوژانەوەی نەوەی نوی، کەم بکرێتەوە.

ئەوەی من دەیڵێم سیاسەتێکی تایبەت بە حزبێك نییە. لەوانەیە بیروڕای جیاجیا لەم بوارانەدا هەبێت، بۆیە پێویستە رێزی رای یەکدی بگرین و ئایدیۆلۆژیا نەکەینە یاسا. چونکە هەر کە ئایدیۆلۆژیا بووە قانوون ئەوە زەمینەی فاشیزم خۆشدەکات. فاشیزم هەر ئەو نموونەیە نییە کە هیتلەر و موسولینی کردیان، ئەوەشە کە سەدام حوسێن کردی، ئەو دیکتاتۆریەیە کە ستالین دایهێنا، ئەوەشە کە تالیبان کردی یان

ئەوەتا لە فەلوجە و سێگۆشەی سوننە دەکرێ. هەریەك بە تایبەتمەندی کەلتوری و توانایی ئابوری خۆی پەیرەوی دەکات.

کەلتوری ئێمە بەم تونێلەدا تێپەریوە و کەسەکانمان بەرهەمی کۆتایی تونێلی توندوتیژی نەتەوەیی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیان. ئێستا هاتووینە قۆناغێك داوای ئازادی دەکەین، کەواتە پێویستە:١- هەموو ئەم واقیعە مێژووییەمان لەبەر چاو بێت ٢- میللەتی کوردستان لەگەڵ عێڕاق، شێوان و نەخۆشیەکانی ئەو مێژووەی پێوەیە بۆیە خاوەنی کەلتورێکی پڕ لە رەگەزی نەخۆشییە. میللەتانی دوای جەنگ و حوکمی دیکتاتۆری هەموویان نەخۆش دەکەون، وەك چۆن لەش نەخۆش دەکەوێ. ئەوەش لە نەخۆشیە کۆمەڵایەتییەکان دەردەکەوێ و باوەڕناکەم بۆ ئێوە غەریب بێت. بۆ نموونە هەبوونی ئەو هەموو نەخۆشە عەقڵییانە (مەبەستم ئەوانەیە کۆمەڵگا بە سوکایەتیەوە پێیان دەڵێ شێت) لە وڵاتێکی بچووکی پێنج ملیۆنیدا، سەرنج راکێشە. چەند کەس لە ئێوە لە خێزانەکانتاندا کەسانی عەسەبی و شێواو هەیە کە توانایی کاری نەماوە؟ لە خێزانەکەی مندا سێ کەس قوربانی ئەم بوارەن، لای ئێوە چەند هەیە؟ چەند کەس لە ئێوە و خێزانەکانتاندا هەیە هێندە وەڕەزە هەر کارێکی بدەیتێ هەر رازی نابی؟! ئەوەش وایکردووە هێدی هێدی نارەزایی ببێتە بەشێکی کەلتوری ئێمە. بۆیەشە هەرچی دەکرێ هەر رەزامەندی دروست ناکات، واتە ئیستقرار بە زەحمەت دێخێ. بەدگۆیی، نارەزایی و گومان تا رادەیەك پەرەی سەندووە لەم وڵاتە دوو برادەرت دەستناکەون پێکەوە کاربکەن و لێکدی بە گومان نەبن! ( ئەگەر وانییە پەنجە لە چاوم رابکەن). ئەوانە نەخۆشین یان نا؟ ئەدی ئەگەر ئەو کەسانە بوونە وەزیر و پەرلەمانتار یان کەوتنە منافەسە بۆ بەدەستهێنانی گرێبەستێکی ئابووری، چ بەسەر یەکدی دێنن؟

پێویستە جورئەتی دەستنیشانکردنی نەخۆشەکانمان هەبێ نەك پلیشاندنەوەیان. دەکرێ حکوومەت دامودەزگای تایبەت بە هاوکاریکردنی دیاردە نەساغەکان دابمەزرێنێ. پێویستە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دیاردەکان دەستنیشان بکەن



و فشاریش بۆ حکوومەت بێنن تا بۆ چارەسەرکردنیان پرۆژەی بە کردەوەی هەبێت. جا ئەگەر حکوومەت بە ئەرکی خۆی هەڵنەستا ئەوسا رۆژنامەنووسان با دەرگای رەخنە بکەنەوە.

ئێمە دەبێ ببینە کۆمەڵگای ئیشکردن، ئەوەی ئیش دەکات لە نەخۆشی دوور دەکەوێتەوە، مافی بۆ دروست دەبێت و دەتوانێ منافەسە بکات.

دێمەوە سەر باوەڕێکی دیکە لەسەر گەنجان کە پێیانوایە هەر کە بلوغیان بوو دەبێ معاشیان بدرێتێ. کەچی لە سیستەمە پێشکەوتوەکاندا رێك بە پێچەوانەوەیە. گەنجان و بە تواناکان کاردەکەن و پیر و منداڵ و پەککەوتەکان بە سیستەمێکی هاوچەرخ لەسەری دەژین. هەڵبەت کەموکوڕییەکانی حکوومەت لە خراپی سیستەمی پەروەردە و دروستکردنی دەرفەتی زیاتر بۆ کارکردن ناشاردرێتەوە بەڵام نابێ فەرهەنگی تەنبەڵی بەمیان بشارینەوە. ئێوە هەقتانە بپرسن چەند کارخانە لە هەولێر و دهۆك و سلێمانی و کەرکوك هەیە تا کاری تێدا بکەین؟ پرسیارەکە بەجێیە، بەڵام منیش دەپرسم چەند بیانی لە کۆمپانیاکانی بیناسازی و بازارەکانی کوردستان کار دەکەن؟ تەنیا ئەوە ماوە فیلیپینی ببەین لە گوندەکانمان کشتوکاڵمان بۆ بکەن! ئەو قسەیەی من بەمانای دژایەتیکردنی بیانی لە کوردستان نییە، نابی راسیست (نەژادپەرست) بین بەڵام ناشبێ ببینە خەلیجی و لەبەر ئەوەی نەوتمان هەیە پاڵبدەینەوە. جا من لەوەوپێش گووتم ئەو میللەتەی کارنەکات زمانی درێژ نابێت، پێویستی بە زانست نابێ، ئینجا سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی هاوچەرخی نابێ، لە کۆتاییدا دیموکڕایسش هەر پێویستیت پێی نامێنێ. کەواتە ئەو هەموو هاتوهاوارەمان لە چیە؟ بەرێز نێچیرڤان بارزانی لە پەیامی نەورۆزدا ئێمەی خستە بەردەم ئەم هەموو پرسیارانە. هەڵبەت حکوومەتی کوردستان لەکوێ پرسیاری لێبکرێ دەبێ لەوێ وەڵام بداتەوە. بەڵام پێویستە پرسیار بە مانای راستەقینەی خۆی بێت.





باسی مافی ئافرەت و منداڵ دەکرێ، لەو کاتەدا پێویستە لە خۆمان بپرسین لەناو خێزاندا تا چەند وەك مرۆڤ رەفتار لەگەڵ ئەو دوو توێژە دەکرێ. سەیری بازارەکانی خۆمان بکە لە پیاسەو رۆیشتن و کڕین و بوارەکانی دیکەدا چۆن رەفتار لەگەڵ هەردوو توێژ دەکرێ. منداڵ بە ئاژەڵی بچووك حساب دەکرێ و ژنیش تا ئێستا هەر کۆیلەیە. ئەگەر من باسی تەجرەبەی خۆمتان بۆ بکەم لەوانەیە نەمتوانیبێ لەو نەخۆشیانەی باسمکردن دووربکەومەوە، لەو بوارەدا قارەمانیش نیم. لەم دوواییە بە نووسینی روخێنەرانە باسی ژیانی تایبەتی من کرا. ئەگەر ژیانی من بۆ هاوولاتیان جێگای پرسیار بێ، ئەوە بۆیان باس دەکەم. بۆ نموونە سێ جار ژنم هێناوە و شانازیش بە تەجرەبە تایبەتییەکانی خۆم دەکەم بەڵام ئەوە تایبەتمەندییەکانی ژیانی منن، باشی و خراپی تێدایە بەڵام تاوان و سڕینەوەی تێدا نییە. پیکاسۆ دەیان جار ژنی هێنا، ئانتۆنی کوینیش دوانزەجار زەماوەندی کرد. ئەوانە لە کارە باشەکانیان ناژمێردرێت بەڵام لە بواری دیکەدا بەرهەمیان هەبوو، لە هەمووی گرنگتر دژی ئازادی ئافرەتانی وڵاتەکەی خۆیان نەبوون. دژی مافەکانی منداڵ نەبوون. ئێمە کۆمەڵگایەکین لەراست مافەکانی ئافرەت و پەروەردەکردنی منداڵدا راستگۆ نین. ئەگەر وانییە وەڵامم بدەنەوە، ئەگەر وایە با نەخۆشی درۆ لەناو کۆمەڵگا نەهێڵین. درۆ نەخۆشییەکە وەك گومان و پیلان و تیرۆر. چارەسەرکردنی بەو گفتوگۆیە فراوانە دەکرێ کە بۆ چاکسازی دەستی پێدەکەین. ئەنجامەکانیشی ئەو رێگاچارانە دەبن کە پێیدەگەین و دوایی فشار بۆ حکوومەت بێنین تا دەست بە چاکسازی خۆی بکات.

هیوادارم وەك هەمیشە بیروراکانم بە بریندارکردنی هەستی هیچ لایەن و کەسێك وەرنەگیرێ و ئامادەم گوێ لە رەخنە پێشنیارەکانتان بگرم.



## پرسیاری خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی

* ئەحمەد جوهر، کۆلێژی ئەندازیاری: کۆڕی یەکەمت جیاوازییەکی زۆری تێدا هەبوو لەنێوان ئەوەی بە نووسین بڵاوکرایەوە لەگەڵ ئەوەی کە لە رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان بیستمان. دەکرێ بزانم هۆی ئەم جیاوازییە چی بوو؟ ئینجا رات لەسەر ئەو رەخنە روخێنەرانە چییە کە دوایی لەسەرت بڵاوکرایەوە؟
* شاخەوان نوری، کۆلێژی کشتوکاڵ: ئەوانەی ئیمزا کۆدەکەنەوە دەڵێن هەڕەشەیان لەلایەن تۆوە لێکراوە، ئەمە تا چەند راستە؟ ئایا ئەوە لەگەڵ کاری راگەیاندن و گفتوگۆ تێکدەکاتەوە؟ ئایا چەند کارتان بۆ کردنەوەی پەیوەندی نێوان گەنجان و حکوومەت کردووە؟
* فریا حوسێن، کۆلێژی زانست: ئایا ئەو قۆناغە پڕ کارەساتانەی کورد پێیدا تێ پەڕیوە واینەکردووە کە تاکی کورد بە هەڵچوون تەعبیر لەخۆی بکات؟ چارەسەریەکەی لە چ رێگایەکدا دەبینی؟
* کاروان غەریب، کۆلێژی پەروەردە: ئەو توندی و فشارەی لەسەر کاك سەرۆ و بیروڕاکانی هەیە، ئایا ئەویش هەمان شێواز بەرامبەریان بەکاردێنێ، ئەوە لە کاتێکدایە کە من دەزانم دەستی سەرۆ قادر لە دروستکردنی راگەیاندنی کوردیدا چەند درێژە و دەستخۆشی لەسەر ئەم کارەی لێدەکەم.
* ئالان عەبدوڵا، کۆلێژی زانست: لە راگەیاندندا ئەوەندەی باسی مافی گەنجان دەکرێت، باسی ئەوەش دەکەن کە ئەرکیان چییە؟ گەنج رەخنە لە دەسەڵات دەگرێت، کاتێك باسی بێکاری دەکات، ئایا ئامادەیە هەمان کار بکات کە گەنجێکی رۆژاوایی دەیکات؟ ئەو گەنجانەی کە هاندرابوون ئیمزا لەسەر کاك سەرۆ کۆبکەنەوە، بۆچی ئیمزا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی کۆناکانەوە؟ یان بۆچی داوای جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ ناکەن؟

* سامان سدیق، کۆلێژی زانست: کاك سەرۆ پۆستێکی سیاسی هەیە و پۆستێکیشی لە بواری راگەیاندن هەیە. ئایا ئەو شەڕەی لە نێوان ئەو و رۆژنامەنووساندا دروست بوو جۆرێك نییە لە شەڕی سارد جگە لە خۆی دژی راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستانیشە. ئەو رەخنە و قسەلۆکەی لەسەری دروست بووە، ئەگەر ئەو دوو پۆستەی نەبوایە، پێیوایە وەك رۆشنبیرێك دژایەتی دەکرا؟

* کارۆ کامەران، کۆلێژی زانستە سیاسییەکان: پرسیاری من ئەوەیە لە ناو راگەیاندنی کوردستاندا رەخنە چ مانایەکی هەیە؟ ئایا کەمبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی نەبووەتە هۆی دروست بوونی ئەم دیاردانە؟

## وەڵامەکانی سەرۆ قادر:

زۆر سوپاسی رەخنەکانتان دەکەم دوایی بۆ پرسیارەکان. تاکو وەختتان زۆر نەگرم هەوڵدەدەم هەموو پرسیارەکان پێکەوە ببەستمەوە و وەڵامەکانیشیان هەر بەم چەشنە بدەمەوە.

هەر کەسێك لە قسەکردنی سەرپێیی ناو رادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا جۆرێك لە تێکەڵاوی و بێ دیققەتی بەکاردێنی بەڵام کاتێك بیەوێ بە نووسین بڵاوی بکاتەوە، لەرووی زمانەوە چاکی دەکاتەوە و دیققەتی تێدخات بەڵام نابی زیادی و کەمی لە ناوەرۆکدا دەسکاری بکات. بۆ نموونە لەوانەیە شەش وشەی هاومانا لەدوای یەکدی ریز بکەم کە لە نووسیندا یەکیان پێویستە. نووسەر کاتێك قسە دەکات و دوایی بڵاوی کردەوە ئەویان لەسەری حساب دەکرێ. ئەو کەسانەی گفتوگۆیان گەرەکە ئاوها رەفتار لەگەڵ یەکدی دەکەن. سەبارەت بە کاری رۆژنامەکان، ئەوەی قسەکانی نووسەرێك بڵاودەکاتەوە، مافی خۆیەتی چەندی لێ وەردەگرێ و چۆنی بڵاودەکاتەوە بە مەرجێك نەیشێوێنێ. تەلەفزیۆن و رادیۆکانیش هەر وادەکەن. چونکە لە یەکێکیان



وەخت مەحدودە و لەویتریاندا لاپەرەکان بە ژمارەن. من لە دانیشتنی یەکەمدا، پەنجا دەقیقە قسەم کردووە، هیچ تەلەفزیۆنێك ئەو هەقەم پێنادات، هاووڵاتیانیش ناچار ناکات ئەو ماوە درێژە گوێ بۆ قسەی من بگرن. بۆیە قسەکانم دەکاتەوە نیو سەعات، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو ماوەیەی بۆی تەرخانکردووم مەبەستەکەی منی گەیاندبێت. خۆ ئەو شێوازە لەسەر مام جەلال و سەرۆك بارزانیش بەکاردێنن. کەواتە ئەوە شێوازێکی کاری گەیاندنی راگەیاندنە و ئەوانەی خوێندوویانە دەزانن ئەوە هونەرێکە بەڵام دەبێ راستگۆیی تێدا بێت. ئەوەی من بڵاومکردۆتەوە لێی بەرپرسیارم، باوەڕناکەم لە ناوەرۆکیدا لەگەڵ دەنگ و رەنگدا جیاوازی هەبووبێ، فەرموون نموونەکەیم بدەنێ. لە کۆڕی یەکەمدا رستەیەکی درێژی من قۆزرایەوەو لەوەوپێشیش قسەم لەسەر کردووە بۆیە نایەمەوە سەر باسکردنی. ئەو کەسەی لە بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی خۆیدا بێ دیققەتی و دووبارەکردنەوە و زمانی سەقەت بەکاربێنی ئەوە هەر نووسەر نییە. لە نووسیندا دەبێ بە کەمترین وشە زۆرترین مانا بگەیەنێ. لەبیریشتان نەچێ پێگەیشتنی زمان تا ئێستا لەسەر نووسینی سەر کاغەزە نەك لە گوفتاردا. دیققەت لە نووسیندایە، بۆیەش مامۆستاکانی ئێوە لە زانکۆکاندا چەندی جوانیش دەرس بڵێنەوە ئینجا دوایی مەلزەمەتان دەداتێ چونکە دیقەت لەوێدایە.

سەبارەت بە وشەی رەخنەی روخێنەر، من پێموایە هەرچی روخێنەر بێت ئەوە رەخنە نییە. رەخنە چەمکێکی زانستیە و زمانزانەکان دەزانن چەمکی رەخنە لەخۆیدا سەرەرای تیۆری جیاجیا، ئامانجەکەی لەمانەدا کۆدەبێتەوە: ١- وەسفکردنی واقعی حاڵە ٢- نیشاندانی ناکۆکییەکانیەتی ٣- دەستنیشانکردنی ئەرکەکانییەتی ٤- لە دواییدا بەرهەمی ئەرکەکەی باسدەکرێ ٥- لە کۆتاییدا دەکرێ بڵێین ئەو بەرهەمەمان بەدڵ نییە لەبەر هەندێ پێویستە ئەم سیستەمە گۆڕانکاری تێدا بکرێ. لەم کارەدا چ شێوازێکی زمانەوانی بەکاردێنی، ئازادی بەڵام نابێ مافی خەڵکی دیکە پێشێل بکرێ و بەدناوکردنی تێدانەبێ، جەنگی دەروونی لەدژی وەرێ نەخرێت و





سەلامەتی نەخرێتە مەترسییەوە. دەنا هەر نووسەر و قسەکارە، شێوازی تایبەتی خۆی هەیە. ئەمە روانگایەکی سادەیە بۆ رەخنە. ئەوانەی لەو بوارەدا کاردەکەن و دەیخوێنن دەزانن فراوانترە. هەر بۆیەش رەخنە وەك لۆکۆمۆتیڤی پێشکەوتنی مرۆڤایەتییە لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا. هەر ئەو گفتوگۆیەی نێوانمان جۆرێکە لە کاری رەخنەیی کە چارەسەرییەکانی لای من و لای ئێوەش بە تەنیا کافی نییە. پێویستە دامودەزگای تایبەتی لەم بوارەدا کاری جدی و زانستی بکەن. تا گەیشتن بە چارەسەری نیهایی، جاری وا هەیە چەندین رێگاچارە تاقیدەکرێنەوە تا دەگەنە باشترینیان. بۆیە ئەگەر ئەم هەوڵە بۆ روخاندن بەکارهات ئەوە لە جوغزی رەخنەو رۆژنامەنووسی و نووسەرێتی دوور دەکەوێتەوەو دەبێتە پوچیگەری (نەهیلیزم- العدمیة). ئەو کەسانە پێویستە لێیان بکۆڵدرێتەوە ئاخۆ لەرووی دەروونیەوە سەلامەتن یان نا؟ ئەگەر ساغ دەرچوون، ئەری ئامانجێکی ئابووری یان سیاسی یان مافیایی لە پشتیانەوەیە یان نا؟ ئەگەر یەکێك لەوانەی لەپشت بوو ئەوە بە تاوان حساب دەکرێ و دەدرێتە دادگا. کەواتە ئەو کەسانە رەخنەگر نین چونکە رەخنەگر سازندە و چاکەکارە( ریفۆرمیستە).

سەبارەت بە هەڕەشەکردن، کەسێك توانای گفتوگۆی مەنتقی هەبێت بۆچی هەڕەشە دەکات! لە کۆمەڵگادا ئەو کەسەی توانایی دروستکردنی بیروڕای هەبێت ئەوە پێویستی بە ئامرازی هەڕەشە و ترساندن نییە. ئەو کەسانە لە بیروڕاگۆڕینەوە ماندوو نابن و ئەوەش کارێکی چاکسازی و زانستییە. ئەوە تایبەتمەندی زانکۆ و مەڵبەندە رۆشنبیرییەکانی کوردستانە. هەروەها شێوازی سیاسەتمەدارەکانی کوردستانە بە چەشنە ئینسانییەکەی. بۆیە ئەو کەسەی دەڵێ سەرۆ قادر هەڕەشەی لێکردوم با بە بەڵگەوە بچێ شکایەت بکات. هەروەها سەرۆ قادرو غەیری ئەویش ئەگەر زمانی هەڕەشە بەکاربێنن، نابێ باسی گفتوگۆ و چاکسازی کۆمەڵایەتی بکەن. ئەگەر وابێ ناتوانن باسی رەخنەگرتن لە حکوومەت و کۆمەڵگا بکەن چونکە شێوازی مافیایی بەکاردێنن. بۆیە من ئەوە نیم چونکە مافیایی نیم. ئەمرۆ نا بەڵام رۆژگارێك



دێت شاهیدی دەدەن کە من کاتێك کار دەکەم و رەخنەم لێدەگیرێ یان هێرشم دەکرێتەسەر، کەسانێك بە راستەخۆ یان ناراستەخۆ بۆ دیفاعلێکردنم هان نادەم. بێمنەتم لە هەر نووسەر و ئاسایشێکی ئەم وڵاتە کە بڵێ سەرۆ رۆژێك داوای تەمبێ کردن یان هەڕەشەکردن لە کەسێکی لێکردووم. ئەگەر کەسانێك هەن بەو قسانە نان دەخۆن ئەوە عافیێتیان بێت بەڵام شێوازەکەیان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگا نابێت. ئەگەر ئەو کەسانە بەشێك لەو مەکینە سیاسییە بن کە نایەوێ حکوومەت کاری خۆی بکات و باسی چاکسازی ئیداری و کۆمەڵایەتی بکات، ئەوە کارەکەیان تێکدەرانە و پاشکەوتنخوازانەیە چونکە حکوومەتی کوردستان، لەو حکومەتە دەگمەنانەی رۆژهەڵاتە کە بانگ دەدات: ئەی کۆمەڵگا ئێمە خۆمان چاك دەکەین و تۆش توانایی چاکسازی وەبەرخۆت بنێ. رۆژێك سەرۆکی حکوومەت داوای لە کۆمپانیاکان کردبوو کرێکار لە دەرەوە نەهێنن. خاوەنی کۆمپانیاکان وەڵامیان دابووەوە کارەکانیان دەوەستێ چونکە ١- ژمارەی ئەو کرێکارانەی لە کوردستاندا ئامادە کارکردنن زۆر کەمن. ٢- کرێکار لە گەردی بەیانییەوە تا زەردەی ئێوارە دەبێ کار بکات. کەچی ئەوانەی کوردستان سەعات دە دێن و دوای سەعاتێك چێشتەنگاو دەخۆن و پاش کەمێك نوێژی نیوەڕۆ دەکەن و دەچنەوە ماڵ نانی نیوەرۆ دەخۆن و دەستیان گەرم نەبووە بانگی عەسرە و دیسان نوێژ دەکەنەوە و دوایی دەڕۆنەوە. بەم فەرهەنگە کار بەرێوەناچێ و وەبەر نایات.

جارێکی دیکە سەرۆکی کوردستان داوای لە سەرۆکی حکوومەت کرد پشتیوانی لە بەرهەمی کشتوکاڵی ناوخۆ بکرێ. وەزیر و لێپرسراوەکان بە ئامار وەڵامیان دایەوە گوندی چۆڵ کە جوتیارەکانی هەموو لە شار و ئۆردوگاکانن و چاوەڕوانی معاشی حکوومەت دەکەن، بە دوو فەردە خەیار و چەند سندوق تەماتە ناتوانن منافەسەی دەیان ترێلەی بەرهەمی بیانی بکەن. ئەوە لە کاتێکدایە بۆ مەسرەفی ناوخۆ پێوستمان بە ژمارەیەکی زۆری بەرهەم هەیە. هەڵبەت لێرەدا نامەوێ پاساو بۆ کەموکوڕییەکانی لێپرسراوان بێنمەوە بەڵام سروشتی ئینسان بەجۆرێکە لە منافەسە و





خۆشیدا جوانترین هەڵدەبژێرێ. میوەی وڵاتی ئێمە لە هی هەموو وڵاتان خۆشترە بەڵام ئایا جوتیارەکانی کوردستان دەیکەن؟ ئایا حکوومەتیش پرۆگرامی هاندان و هاوکاریکردنی هەیە؟ ئەمە حاڵی وڵاتی ئێمەیە. کەواتە رەخنەگرتنمان لە یەك لاوە نییە.

ئەو ناوەندانەی تەنگژەیان ناوەتەوە ئامانجیان هەیە ئەویش١- دەیانەوێ حکوومەت نەتوانێ لە پیشەسازی و نۆێکردنەوەی وڵات بەردەوام بێت ٢- چاکسازی کۆمەڵایەتی دەست پێنەکات. لە هەموو دنیادا کاتێك چاکسازی کراوە کە سەرۆکایەتی وڵات لە پێشەوە بڕوات. یەك نموونە لە دنیادا نییە خەڵك بە تەنیا خۆی چاککردبێ و سەرۆکایەتییەکەی لە دواوە بووبێ یان رێگای لێگرتبێ. سەیری نموونەی ژاپۆن بکەن ئیمپراتۆری (پادشا) خۆیان لەگەڵ دین تێکەڵ کردووە چونکە پیشەنگی پێشخستنی ئەو وڵاتە بووە.

ئەو نموونە ناوخۆییە سەلبییەی باسمکرد، پاشماوەی کێشەی چەکداری ناوخۆیین چونکە جگە لە چەك و سێرەگرتن و بەردانەوەی مرۆڤ هیچی دیکە نازانن. لەو کارەشدا بەشێك لە تکنۆلۆژیای راگەیاندن بەکاردێنن و ئەوانی کاریشیان لەگەڵ دەکەن رۆژنامەنووس نین. کەی رۆژنامەنووس ئەو قسە قێزەوەنانە دەنووسێ کە هیچ پەیامێکی تێدا نییە؟ بە پێچەوانەوە رۆژنامەنووس رەخنە بۆ چاکسازی و دەرخستنی کەموکوڕییە شاراوەکان دەگرێ و لەکاری خۆیدا راستگۆیە و تێکەڵی پیلانگێران نابێت و تاوان ناکات هەر بۆیە مرۆڤێکی خێرخوازی ریفۆرمیستە.